# محمد عبدالله دەراز

## فەیلەسوفی قورئان

## ژیان و بەرهەمی

نوسینی: محمد المختار الشنقیطي

وەرگێڕانی: نزار لەتیف ئەحمد

# محمد عبدالله دەراز

## فەیلەسوفی قورئان، ژیان و بەرهەمی

.......................................................................

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی هزریی و ڕۆشنبیریی خاڵ (١٥)

**نووسینی:** محمد المختار الشنقيطي
**وەرگێڕانی:** نزار لەتیف ئەحمەد
**دیزاین:** ڕەوشت محەمەد
**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
چاپخانە: هێڤی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (   )ی ساڵی ٢٠١٧ی پێدراوە

# پێشەکی

ئەمە کۆڵینەوەیەکی پوختە بۆ ناساندنی دکتۆر محمد عبدالله دەراز-میهری خودای لەسەر-، و چەند لایەنێك لە ژیانی و بەرهەمەکانی دەردەخات. دەخوازم یارمەتیدەری خوێنەر بێت بۆ ئاگادار بوونێکی خێرا لە ژیانی کەڵەزانایەك لە زانا موسوڵمانەکانی سەدەی بیست، پاشان لە ناساندنی هەندێك لەو بیرۆکە گەورانەی دایڕشتوون، تا ببێتە هاندەرێك بۆی لە گەڕانی زیاتر بەدوای ئەو بیرۆکە بەنرخانەی شێخ دەراز بۆی جێهێشتووین لە نوسینەکانی، و ئەو پەندانەی ژیانی لێوانلێوە لێیان.

کەسایەتی (دەراز) کۆکەرەوەی خەسڵەتانێك بوو، کە تەنها کەڵەزاناکانی سەدەی بیستی موسوڵمانان ئەو خەسڵەتانەیان تێدابوو: کۆکەرەوەی ڕۆشنبیری ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا بوو، کۆکەرەوەی زانستی شەرعی و هەڵوێستی شەرعی بوو، هەروەها کۆکەرەوەی قوڵیی هزر و درەوشانەوەی ڕۆح بوو. ئەم خاڵانە، ئەو مەرجانەن کە کردوومنەتە پێوەر بۆ ئەو زانایانەی لە کتێبی (باشترینی هزرە موسوڵمانەکانی سەدەی بیستەم) باسم کردوون، و دەراز لە پێشەنگی ئەوانەدا بوو.

بەڵام پەیوەستییم بە ژیانی دەراز و هزریەوە بەوە نەوەستا کە لەو کتێبەدا باسم کردووە، بەڵکو پاڵنەر بوو بۆ زیاتر گەڕان

لەسەری، و  نوسینی بەشێوەیەکی سەربەخۆ و تایبەت لەم کتێبەدا. ئەم کۆڵینەوەیەم زیاتر لە پێنج ساڵە ئامادەیە بەڵام بارودۆخ ڕێگربوو لە بڵاوکردنەوەی بەزمانی عەرەبی. خوێنەری بەڕێز، ئەوە کۆڵینەوەکەیە لە بەردەستتدا، بە هاوکاریی نێوان (مركز القرضاوي للوسطية الاسلامية و التجديد) و (مركز التشريع الاسلامي و الاخلاق) لە کۆلێژی کۆڵینەوە ئیسلامییەکانی زانکۆی حمد بن خليفه لە قەتەر.

بەهۆی ئەوەی کتێبەکە لەناو پرۆپۆزەڵی کۆڵینەوەیەکدایە بۆ (مركز القرضاوي) بۆیە مەنهەجی قسە لەسەر کردنەکەی، گرنگیدان بەو بوارە زاڵە تیایدا. چونکە پەیامی (مركز القرضاوي للوسطية الاسلامية و التجديد) بڕیاریاندا جەخت بکەینەوە لەسەر بەشداریی دەراز لە ڕێڕەوی میانڕەوی و نوێکردنەوە، و هەوڵمان نەدا بۆ خوێندنەوەی گشتگیری هزری.

جا نوسین و بەرهەمەکانی دەراز، دەچێتە کرۆکی گرنگیپێدانی (مركز التشريع الاسلامي و الاخلاق)ەوە، چونکە شێخ دەراز بەڕاستی دامەزرێنەری زانستی ڕەوشتناسیی قورئانییە لە چەرخی نوێدا، و لەم بوارەدا ڕێڕەوانێکی گرتۆتەبەر کە ڕچەشکێنیی بووە، چ لە باسکردن و چ لە ناوەرۆك، هەروەك ڕوونمان کردووەتەوە لە بەشی کۆتایی دا. بەڵکو ئەو بەهۆی فراوانی هزریەوە، خاڵی کۆکەرەوەی چەند زانستێکە، لەوانە:

**زانستی قورئان، و مێژووی ئاینەکان، و زانستی ئەخلاق....و جگە لەمانیش.**

**سوپاسی زانای پایەبەرز یوسف القرضاوي -خودا بیپارێزیت- دەکەم بۆ بەئەمەکی بەرامبەر شێخ دەراز، و یارمەتیدانی لەم کارەدا بە کردنەوەی خەزێنەی کتێبخانە تایبەتەکەی خۆی بۆم، تا منیش چاوم بکەوێت بە نوسین و بەرهەمەکانی دەراز نوسیونی و ئەوانەشی لەبارەیەوە نوسراون.**

**هەروەك سوپاسی هەردوو مامۆستای پایەبەرز: دکتۆر محمد خلیفە حسن، بەڕێوەبەری (مركز القرضاوي للوسطية الاسلامية و التجديد)، و دکتۆر طارق رمضان بەڕێوەبەری (مركز التشريع الاسلامي و الاخلاق) دەکەم بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەم کارە، و جەخت کردنەوەیان لەسەر بڵاوکردنەوەی لەنێو بڵاوکراوەکانی ئەو دوو سەنتەرە.**

**سوپاسی شێخ مجد المكی دەکەم، کۆڵەر لە (مركز القرضاوي) بۆ خوێندنەوەی دەستنوسی کتێبەکە دووجار: جاری یەکەم پێنج ساڵ پێش ئێستا کە نوسیم، و جاری دووەمیش کاتی ئامادە کردنی بۆ چاپ. شێخ مجد هەندێك تێبینی بەنرخی هەبوو لەسەری. و سوپاسی مامۆستا عبدالرافع محسن دەکەم بۆ پێداچوونەوەی زمانەوانی بە وردی و وریایی، هەروەك سوپاسی مامۆستا لمی زين الدين بەڕێوەبەری (الشبكة العربية للابحاث و**

النشر)دەکەم بۆ بەدواداچوونی بڵاوکردنەوەی کتێبەکە و چاپکردنی بە ئارامگریی و کۆششکردنەوە.

داوای میهری خودا دەکەم بۆ گیانی پاکی بەڕێز، دکتۆر احمد مصطفی فضلیة (١٩٦٤-٢٠١٣) کە ساڵانێکی زۆری تەمەنی تەرخان کردبوو بە جدی و بێ مانوو بوون، بۆ بەدواداچوونی بەرهەمەکانی دەراز، و پشتڕاستی ئەوانەی کردەوە کە بڵاو نەکرابۆوە پێشتر. بەداخەوە نەگونجا بۆم یەك ببینین لەگەڵ ئەم پیاوە بەڕێزە، بەڵام چەندین جار تەلەفۆنم بۆ کردووە، کاتی ئامادە کردنی ئەم کۆڵینەوەیە، بۆ پرس و جۆ کردن دەربارەی هەندێك لە بەرهەمەکانی دەراز، و ئەویش بەردەوام دەرونێکی بەخشندە، و سینەیەکی فراوان، و دڵێکی دڵسۆزی هەبوو. پاشان لەپڕ هەواڵی دڵتەزێنی کۆچی دواییم بیست لە ٢٠١٣، و تەمەنی ٤٩ ساڵییدا. میهری خودای لەسەر بە فراوانی، و لەگەڵ ئەو کۆمان بکاتەوە بە مامۆستاکەی خۆی و مامۆستای ئێمەش، شێخ محمد عبدالله دەراز لە بەهەشتی نەبڕاوەی خۆی.

پێش تەواو کردنی ئەم پێشەکییە، دەمەوێت بڵێم خانەوادەی دەراز-سەرەڕای ئەوەی لە باوك و باپیرانەوە میسریین- بەڵام سۆز و پەیوەندییەکی تایبەتی هەبووە لەگەڵ خەڵکی ڕۆژاوای عەرەبی، کە ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بێت کە ئەم خانەوادەیە هەر لە زووەوە لەسەر مەزهەبی پێشەوا مالیك بوون، و زانستیش وەك

وتراوه، نزیکییه لەنێوان هەلگرانی. شێخ عبدالله دەراز-باوکی دکتۆر محمد دەراز- ڕاڤەی کتێبی (الموافقات)ی کردووه کە هی فەقیهی ئەندەلوسی (ابو اسحاق الشاطبي)یە، و دەرازی کوڕیشی تەحقیقی کردووه، پاشان کتێبێکیشی نوسیوه دەربارەی کتێبی (الاعتصام) ی هەمان نوسەر، و هەوڵیداوه دووباره بیرۆکەکانی ئەو کتێبه بێنێتەوه مەیدان له کتێبی (المیزان بین السنة و البدعة) کە پێش تەواو کردنی کۆچی دوایی کرد، میهری خودای لەسەر.

پاشان له مامۆستاکانی ئەم زانایه، کە مۆڵەتیان پێداوه له زانستی فەرمودەناسی، دوو زانای ڕۆژاوای عەرەبی بوون، ئەوانیش: شێخ محمد عبدالحی الکتانی (١٨٨٤-١٩٦٢) و شێخ حبیب الله بن مایابی الشنقیطي (١٨٧٨-١٩٤٣). دەراز له پێشەکی کتێبی (المختار من کنوز السنة) باسیان دەکات، له کاتی باس کردنی سەبارەت بە سەنەدی خۆی له وەرگرتنی زانستی فەرمودە، کە دەڵێت:"فەرمودەکانی سەحیحی بوخاری هەمووی و زۆرێکی سەحیحی موسلیم، دەگێڕمەوه لەڕێی مامۆستا و شێخە میسرییەکانمانەوه، کە ئەوان خوێندوویانەتەوه و من گوێبیستی بووم. هەرچی کتێبەکانی تری فەرمودەیە، ئەوا بە مۆڵەت وەرگرتن له زانای ناسراوی ڕۆژاوا شێخ محمد عبدالغنی الکتانی، کاتێك بە میسردا تێپەڕی بۆ گەشتی حەج کردن. و بە مۆڵەت

**وەرگرتن لە فەرمودەناسی فەقیهی بەتوانا، شێخ حبيب الله الشنقيطي، كە ماوەیەك لە میسر دەژیا" پاشان مۆڵەتنامەکەی هێناوە کە الشنقيطي بە دەستی خۆی بۆی نوسیوە.**

**کاتێك دەراز لە فەرەنسا خەریکی خوێندن بوو، ناوەڕاستی سەردەی بیستەم، پەیوەندییەکی پتەویان بۆ دروست بوو لەگەڵ فەیلەسوفی جەزائیری (مالك بن نبی)، و لێکچوونێکی هزریی گەورە دەرکەوت لەنێوانیان لە گرنگییدانە هزرییەکانیان، و ئەو ئەنجامانەی پێی گەیشتوون، بەتایبەتی لە بواری کۆڵینەوە قورئانییەکان. دەراز باسی ئەمە دەکات لەو پێشەکییەی بۆ کتێبی (الظاهرة القرآنية)ی (مالك بن نبی) نوسی، ئەمەش بابەتێکە، خوێنەر لێی بێ ئاگا نابێت کاتێك بەراوردی ئەم کتێبەی (مالك بن نبی) دەکات لەگەل هەردوو کتێبی (النبأ العظيم) و (مدخل الى القرآن الكريم)ی دەراز. بە وردی دواوین لە بەشی سێیەم لەسەر نزیکیی هزریی نێوان ئەم دوو زانا گەورەیەی سەردەمی هاوچەرخ.**

**بەڵام کار لە پەیوەندیی هزریی و نزیکیی ئاوەزیی گەورەتر بوو لەنێوانیان بۆ هاریکاریی برایانە و تێکۆشانی هاوبەش، بۆیە دەراز ئازایانە پشتگیریی داخوازیی سەربەخۆیی وڵاتانی ڕۆژاوای عەرەبی کرد لەگەڵ داخوازییکارانیی، لەژێر چنگی داگیرکەریی**

فەرەنسی، و گوێی نەدا بەوەی خوێندکارێکی کۆچکردووە و لە فەرەنسا نیشتەجێیە، لەپێناوی ئەو داواکارییە.

ئەمڕۆ دڵخۆشم-وەك یەکێك لە نەوەکانی ڕۆژاوای عەرەبی- دەربارەی دەراز و هزری بنوسم، و خوازیارم ئەم کۆڵینەوەیە شتێك بێت لە بە ئەمەکی بەرامبەر چاکەی زانستی و کرداریی ئەم زانایە بۆ ڕۆژاوای عەرەبی، و هەموو ئوممەتی ئیسلامیی، سەبارەت بەم خێزانە زانستییە درەوشاوەیە.

خوداش یارمەتیدەری هەموو چاکەیەکە و هاوبەشی نیە.

محمد المختار الشنقيطي

دەوحە-قەتەر

١٠ ی ڕەمەزانی ١٤٣٦

٢٠١٦/٦/١٥

# دەروازەی کۆڵینەوە

پەیوەندی من لەگەڵ زانای بیرمەند دکتۆر محمد عبدالله دەراز-میهری خودای لەسەر- ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا دەستی پێکرد، لە ساڵی ١٩٩٠ بوو، ئەو کاتەی هەردوو کتێبی (الظاهرة القرآنية و وجهة العالم الاسلامي)ی بیرمەندی جەزائیری (مالك بن نبی)م دەخوێندەوە بە وەرگێڕانی دکتۆر (عبدالصبور شاهین). وەرگێڕانەکەی دکتۆر شاهین زۆر سەرسامی کردم بۆ کتێبەکانی (مالك بن نبی) بەهۆی جوانی داڕشتن و دەربڕینەکانی.

لە کتێبخانەیەکی بچوك لە شاری (العیون)ی مۆریتانیا، هەر ئەو ساڵە چاوم کەوت بە ناونیشانی کتێبێك لە نوسینی دکتۆر دەراز:"دستور الاخلاق فی القران"، و تا ئەوکاتە نە کتێبەکە و نە نوسەرەکەیم نەدەناسی، بەڵام کتێبێکە دەربارەی قورئان، و وەرگێڕەکەی دکتۆر (عبدالصبور شاهین) بوو، ئیتر ئەوە بەس بوو بۆ من کە هۆکار بێت بۆ کڕینی! کتێبەکەم کڕی بێ ئەوەی بەهاکەی بزانم، بەڵام هەر زوو بۆم دەرکەوت کە دەستم خستۆتە سەر خەزێنەیەك لە خەزێنەکانی هزری ئیسلامی، و سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی روحی قورئانی.

**کتێبەکەم لە چەند ڕۆژێکی کەمدا خوێندەوە، هەرچەند ژمارەی پەڕەکانیشی زۆرن، و دەستەواژەکانی گرانن، و بیرۆکەکانیشی قوڵن، پاشان دوبارە دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی، و ئاواتەخواز بووم کۆتایی نەیەت. لە کۆتاییدا بۆم دەرکەوت، دکتۆر دەراز خەزێنەیەکە لەو خەزێنە شاراوانەی کە پێگەی خۆیی پێنەدراوە لە نەخشەی هزری ئیسلامیی دا، بەهۆی جەنجاڵی، و تێکەڵاوی دەنگەکان، و پشێوی ئەو ڕۆشنبیرییەی لەم سەردەمەدایە.**

**ڕۆژان تێپەڕین، و دەراز هەر بە زانایەکی ئیلهام بەخش مایەوە لای من، و ڕۆژانە لە سەرچاوەی هزر و روحی هەڵدەگۆزم تا ئەمڕۆ. بۆیە هەستم کرد مافێکی لەسەرمە بۆ نوسینی ئەم کۆڵینەوەیە تا ژیانە دەوڵەمەندەکەی ئاشکرا بکەم، و چەند لایەنێك لەو هزرە گەورانەی دایڕشتوون دەریخەم، بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەك بۆ ئوممەتی ئیسلامی و سەرجەم مرۆڤایەتی.**

# کۆڵینەوەکانی پێشوو

چەند کۆڵینەوەیەك دەرچوون پێشتر دەربارەی دکتۆر دەراز، و ئەمەش پرسیارێك دەوروژێنێت سەبارەت بە گرنگ بوونی ئەم کۆڵینەوەیە. بە کورتی لە دوو خاڵدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەمەوە:

یەکەم: کۆڵینەوەکانی پێشوو دەبنە دوو بەشەوە: بەشێکیان تەنها کۆکردنەوە و نوسینەوەی بەرهەمەکانییەتی. شێخ عبدالله الانصاری شێخی قەتەر-میهری خودای لەسەر- ئەم بەشەیانی دەست پێکردووە، بە کۆکردنەوەی بەرنامە ڕادیۆییەکانی شێخ دەراز و لێکۆڵینەوەیان و بڵاو کردنەوەیان لە دوو کتێبدا لەژێر ناونیشانی "من اخلاق القران"، و "حديقة الازهار". فەرمانگەی کاروباری ئاینیی قەتەر بڵاوی کردۆتەوە لە چاپێکی نوێدا و بە شێوازێکی جوان.

پاشان ئەم جۆرە لە گرنگیدان بە بەرهەمەکانی دەراز وەستا بۆ ماوەی دوو دەیە تا خوای گەورە کەسێکیتری خەڵکی شارۆچکەکەی دەراز خۆیی تەرخان کرد بۆ گرنگیدان بە بەرهەمەکانی و کۆکردنەوەی لە سەرچاوەکانییەوە، ئەویش مامۆستا احمد مصطفى فضلية-میهری خودای لەسەر- بوو. ئەم مامۆستایە بەتوانا بوو لەو بوارەدا، و سەلماندی کە دڵسۆز و

لێهاتووه و خۆشەویستیی دەراز و هزری وی هاندەری بوو بۆ کارکردنی، و زۆرینەی کتێبە نەناسراوەکانی تەحقیق کردوو، و وانە و ستونە پەرتەکانی کۆکردەوە، و لە چەند بەرگێکدا بڵاوی کردەوە، لەوانەش "حصاد القلم"، و "دراسات اسلامية في العلاقات الدولية و الاجتماعية"، و "زاد المسلم للدين و الحياة"...و جگە لەمانیش. هەر ئەویش کتێبی "محمد عبدالله دراز: دراسات و بحوث بأقلام تلامذته و معاصريه"ی کۆکردەوە و بەچاپی گەیاند.

بۆیە قەرزارباری مامۆستا (فضلية)ین بۆ دەستکەوتنی بەرهەمە پەرتەوازەکانی دەراز، هەروەك قەرزاری وین لە زانینی تێڕوانینی قوتابییەکانی سەبارەت بە دەراز. چوون پێش هەوڵەکانی ئەم بەڕێزە، زۆرینەی خوێنەرە عەرەب و موسوڵمانەکان نەیاندەزانی دەربارەی کتێبەکانی دەراز جگە لە کتێبی "دستور الاخلاق في القران" و "النبأ العظيم" و "الدين" و بە ڕێژەیەکی کەمتریش کتێبی "مدخل الى القران الكريم" بە زمانی فەرەنسی.

هەروەك قەرزارباری وین بەهۆی دەرخستنی زۆرێك وردەکاریی ژیانی دکتۆر دەراز کە لە خانەوادەکەی وەریگرتون، یاخود لە نوسینە تایبەتەکانی، ئەو وردەکارییانەی زۆر گرنگن بۆ کەسێك بیەوێت لەم کەسایەتییە گەورەیە تێبگات و هەروەها تێبگات لە گرنگترین کارتێکەرەکانی ژیانی و هزری.

**بەڵام کارەکانی مامۆستا (فضلية)-لەگەڵ گرنگی و پایەبەرزیی-لە هەڵە بەدەر نیە، وەکو:**

- ❖ **کۆکردنەوەی بەرهەمەکانی دەراز، هەندێکجار بێ کۆکەرەوەیەکی لۆجیکی ڕوون لەنێوان بڕگەکانی (بڕوانە ئەم تێبینییانە لەسەر کتێبی:"محمد عبدالله دەراز: دراسات و بحوث بأقلام تلامذته و معاصريه").**

- ➢ **زۆرێك لەو ستونانەی کۆیکردونەوە و بڵاوی کردونەوە، سودێکی ئەوتۆی گرنگ نابەخشێت سەبارەت بە دەراز و هزری. ڕەنگە بیانووی بۆ بێنینەوە بەوەی کاری وی کۆکردنەوە بووە نەك لێهەڵبژاردن و هەڵسەنگاندن، و ئەو بەرپرس نیە لە بەهای ئەو کارانەی کەسانیتر نوسیویانە دەربارەی دەراز.**

- ❖ **ماوەتەوە سەیرترین نمونە بۆ ئەو کەموکورتییانە، ئەویش ئەوەیە کە مامۆستا فضلية کۆڵینەوەیەکی لەسەر دەراز بڵاوکردۆتەوە بەناونیشانی:"مؤسس علم الاخلاق القرآني" لەنێو کتێبی:" محمد عبدالله دەراز: دراسات و بحوث بأقلام تلامذته و معاصريه "و داویەتییە پاڵ انور الجندی. ئەم کۆڵینەوەیە هەمووی گواستنەوەیەکی وشە بە وشەی دەروازەی کتێبی :"دستور الاخلاق في القران"! جا دەچێتە عەقڵەوە کە مامۆستا انور الجندی ئەو پێشەکییەی کردبێت بەناوی خۆیەوە کە**

پێشەکی دیارترین کتێبی دەرازە لەناو خەڵکدا؟ یاخود هەڵە لە گواستنەوەکەی شێخ (فضلیة)یە لە انور الجندی؟

ئەوەیان کە گونجاوترە ئەگەری دووەمە نەك یەکەم. بەتایبەتی انور الجندی بابەتێکی نوسیوە لە کتێبی:" محمد عبدالله دەراز: دراسات و بحوث بأقلام تلامذته و معاصریه" بەناونیشانی:"الاستاذ الدکتور محمد عبدالله دراز في آثاره العلمیة"، کە ستونێکی ڕەسەنە و هیچ ئاماژەیەکی تێدا نیە بۆ نەپاراستنی ئەمانەتی زانستی، پاشان ئەو —بە بۆچونی من- عەقڵی لەوە گەورەترە و ژیریشی لەوە زیاترە کە بەو جۆرە کارێکی دەراز بکات بەناوی خۆیەوە!

لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا، مامۆستا فضلیةم ئاگادار کردەوە لەم بابەتە نامۆیە، و ڕوونکردنەوەی تەواو پێنەدام سەبارەت بە هۆکارەکەی، بەڵام بەڵێنی پێدام ئەم هەڵەیە ڕاست بکاتەوە لە چاپەکانی دواتری کتێبەکەدا، و ڕەنگە مردن ڕێگەی پێنەدابێت ئەم کارە زانستییە بەجێ بهێنێت، میهری خودای لەسەر، و لێشی قەبوڵ دەکرێت.

دووەم: ئەو کارانەی بەشێوازی شیکاریی دەربارەی کەسێتی دەراز و هزری کراوە. گرنگترینی ئەمانەش-تا ئەو ڕادەیەی من دەزانم- تا ئێستا دوو کتێبن:

- **کتێبی د.حافظ محمد منير الازهري"محمد عبدالله دراز و جهوده في الفكر الاسلامي المعاصر" کە هەوڵێکە بۆ ناساندنی دیدگای هزریی دەراز، بەڵام سروشتێکی کلاسیکی و پارێزکارانەی هەیە، بۆیە زۆرێك لە هزرە نوێکارییەکانی دەرازی پشتگوێ خستووە، و سنورداری کردوە بە سنوری ڕۆشنبیری کلتوریی، و پابەندی کردووە بە چەند بەڵگەنەویستێکی لاواز لەڕووی بونیادەوە کە دەراز دەیویست بە کۆششە نوێکارییەکانییەوە تێیانپەڕێنێت. هەروەك پێناسە و گفتوگۆی دوور لە کرۆکی باسەکە و درێژکردنەوە زاڵە بەسەریدا. ئەگەر سودێکی هەبێت ئەم کتێبەی د.ئەزهەری ئەوە ئەوەیە کە هزری دەراز پێویستە مافی بزانرێت و پەی ببرێت بە قوڵییەکەی.**

- **کتێبی:" محمد عبدالله دەراز: دراسات و بحوث بأقلام تلامذته و معاصريه"کە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، لە کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی شێخ مصطفى فضليةيە، و پەنجا بابەت-دوای ڕێخۆشکردن و پێشەکی- لەخۆی دەگرێت و زۆرینەی پێشتر لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان بڵاوکراونەتەوە. بەڵام کتێبەکە گونجاندنی مەنهەجیی پێویستە، بەجۆرێك پێناسەی دەرازی بە پێنوسی (عبدالعظيم المطعني ( خستۆتە گەڵ بەشی"کۆڵینەوەکان دەربارەی هەندێك لە کتێبەکانی". هەروەك کتێبەکە هەندێك دوبارە کردنەوەی ناپێویستی تێدایە، بۆ نمونە: حەوت**

بابەتی تێدایە لەسەر کتێبی:"دستور الاخلاق فى القران"، و چوار بابەت لەسەر کتێبی:"النبأ العظیم"، و سێ بابەت دەربارەی کتێبی:"الدین". پاشان کتێبەکە دوو گفتوگۆ و دوازدە ستونی تێدایە کە دەراز خۆی نوسیونی، ئەگەر چی ناوی کتێبەکەش وا دەردەخات کە تەنها "بأقلام تلامذته و معاصریه" بێت!!

هەروەك چەند تێزێك دەربارەی دەراز نوسراون، لەوانە:

- "الدكتور محمد عبدالله دراز و جهوده في الدعوة": تێزێکی ماستەر لە ئامادە کردنی خوێندکار طامي بن هدیف البقمي، لە بەشی بانگەوازی زانکۆی امام محمد سعود الاسلامیه.

- "الدكتور دراز و جهوده البلاغیه": تێزی ماستەری خوێندکار محمد امین ابو شهبه لە کۆلێژی زمانی زانکۆی ئیتای ئەلبارودی زانکۆی قاهیره.

- "محمد عبدالله دراز و منهجه في البحث الخلقي": تێزی ماستەری خوێندکار محمد البیومی عبدالواحد، لە کۆلێژی بنەماکانی ئاین لە زانکۆی ئەزهەر.

هەروەها مامۆستا احمد فضلیة-میهری خودای لەسەر- دەربارەی پرۆژەی کتێبێکی باسی بۆ کردم کە بەم زوانە لە "کتێبخانەی ئیمان" لە قاهیره دەردەچێت، لەژێر ناونیشانی:"محمد عبدالله دراز...سیرة و فكر". خوازیارم ئەمیان

شیکاریی قوڵتر و پەیبردنی باشتر بێت لە کارەکانی پێشوتر سەبارەت بە شێخ دەراز و بەرهەمەکانی.

ماوەتەوە بڵێین هەموو ئەم کۆڵینەوانە، بێنیازمان ناکات لە کۆڵینەوەی نوێ دەربارەی دەراز. چوون ئاشکرایە ئەم زانایەی دەناسرێتەوە بە ڕەسەنیی هزر و تۆکمەیی ژیربێژیی و گەشاوەیی ڕوح، چاوەڕێی زیاترە، لەوانەی دەتوانن هزر و داهێنان و بەشدارییە نوێکارییەکانی لە هزری ئیسلامییدا، بناسێنن.

هەندێك لە کۆڵینەوەکان دەربارەی هزری شێخ دەراز وێنەیەکی بیرهێنامەوە لە سەرنجێکی مالك بن نبی سەبارەت بە (ابن خلدون): مالك تێبینیی کردووە کە یەکێك لە هۆکارەکانی دارمانی ژیار بریتییە لە:"هزر ون دەبێت، چوون شوێنەوارەکانی پەرت دەبن لەنێوەندێکدا کە ناتوانێت لێی تێبگات یاخود بەکاری بهێنێت، لەم ڕووەوە وا دەردەکەوێت هزرەکانی (ابن خلدون) یا پێش کاتی خۆی کەوتووە یاخود دواکەوتووە لە کاتی خۆی، لەبەرئەوەی نەیتوانی ڕەنگدانەوەی هەبێت لەو کارامەییە ئیسلامییەی نەرمییە تایبەتەکەی لەدەستدابوو، هەروەك توانای پێشکەوتن و نوێبوونەوەشی لەدەستدابوو".

بەهەمان شێوە دەرازیش یا پێش کاتی خۆی کەوتبوو یاخود دواکەوتبوو، چونکە بیرۆکەکانی بڵاونەبۆتەوە لەناو ڕۆشنبیری ئیسلامیی هاوچەرخ دا تا ئەمرۆش. بۆیە پێویستمان بە هێنانەوە

کایەی دەراز هەیە لەم گۆشەنیگا تایبەتەوە لەبەرئەوەی تا ئێستا هیچ کەسێك بەم شێوازە قسەی لەسەر نەکردووە. ئەمەش پاساوی سەرەکی ئەم کۆڵینەوەیەیە. ئێمە لێرەدا ڕوون کردنەوەی بوارەکانی میانڕەوی و نوێکاریی لە هزری دەراز دا دەکەینە ئامانج.

لە بەشی یەکەم لەسەر ژیانی دەوەستین، و بە وردی باسی تایبەتمەندییە کەسییەکانی، و مەنهەجی هزریی، و شێوازی نوسینی دەکەین. پاشان باسی سەرجەم نوسینەکانی دەکەین هێندەی لەتوانادا بێت، جا بڵاوکرابێتەوە لە ژیانی خۆی دا یاخود کۆکرابێتەوە و بڵاوکرابێتەوە دوای کۆچی دوایی خۆی. هەروەها ئاماژەمان داوە بە چاپەکانی بە زمانە جیاوازەکان، ئەوەندەی ئەم پێداچوونەوەیە بواری دابێت.

پاشان بەشی دووەم تەرخان کراوە بۆ تایبەتمەندییە میانڕەوییەکانی هزری دەراز، لەڕێی ڕوونکردنەوەی پێنج لە دووانەییە گەورەکانی وێنای ئاستەنگی جدیین لە هزری ئیسلامییدا، ئەوانیش: ئاوەز و دەق، زانست و ئاین، الجبر و الاختیار، شوێنکەوتن (السنة) و داهێنراو، ئاشتی و جەنگ. مەنهەجی ئاوێتەیی ناوازەی دەرازمان باس کردووە لە مامەڵە کردنی لەگەڵ ئەم ئاستەنگە هزرییانە.

دواتر بەشی سێیەم و کۆتاییمان تایبەت کردووە بە بوارەکانی نوێکاریی لە هزری دەراز. لەو بەشەدا ڕوونی دەکەینەوە کە نوێکارییەکەی بە باشترین شێوە خۆی وێنا دەکات لە زانستی قورئان، چوون دوو زانستی نوێی دامەزراند تیایدا، ئەوانیش (اخلاق القران) و (مصدر القران)، لەگەڵ کورتەیەکیش دەربارەی ئەو مەنهەجەی پایەکانی پێداکوتا لەم بوارەدا.

بانگەشەی ئەوە ناکەین کۆڵینەوەکەمان داهێنانێکی نوێیە یاخود تەواو و بێ کەموکوڕییە. بەڵکو لە خوای میهرەبان دەخوازین ببێتە هەوڵێك لەناو ئەو هەوڵانەی دەدرێن بۆ ناساندنی ئەم زانا گەورە خاوەن روحە درەوشاوەیە. بەڵکو بیرمەندێکی ئیسلامیی بەتوانا خۆی تەرخان بکات بۆ بەدواداچوونێکی فراوانتر و پێشکەشکردنێکی قوڵتری هزری دکتۆر محمد عبدالله دەراز، و ئەوەی ئێمە ئەنجامی دەدەین ببێتە بناغە بۆی.

# بەشی یەکەم
# دەرازی زانا : ژیان و بەرهەمی

### ژیانی :

دکتۆر محمد عبداللە محمد حسنین دەراز مێژووی ١٨٩٤/١١/١٨ لە شارۆچکەی (دیای)ی ناوەندی (دەسوق)ی سەر بە پارێزگای (کفر ئەلشەیخ)ی میسر، لەدایك بوو. لە خێزانێکی خاوەن ڕەوشتی بەرز و ئاییندارییی و زانستپەروەرییی دا گەورە بوو. بەجۆرێك باپیری و باپیری باوکی ناسراو بوون بە وتنەوەی وانەی ئیسلامی لە مزگەوتی عومەرییی لە شارۆچکەکەیان.

شێخ عبداللە دەرازی باوکی (١٨٧٤-١٩٣٢)، یەکێکە لە زانا دیارەکانی ئەزهەر لە علم الاصول و کارامەیی زمانەوانی، و هەستاوە بە ڕوونکردنەوەی کتێبی (الموافقات)ی پێشەوا (الشاطبي)، ئەو ڕوونکردنەوەیەی زۆر جار خوێنەران بە هەڵە دەیدەنە پاڵ دەرازی کوڕ. لە پاڵ ناوی ئەم زانایانە، ناوی عبدالمجید عبداللە دەراز، برای محمد عبداللە دەراز، دێت کە مامۆستای ڕاڤەی قورئان بوو لەگەڵ محمدی برای لە کۆلیژەکانی ئەزهەر.

شێخ عبدالله دەراز، پەروەردەکارێکی دڵسۆز بوو، وەك محمد ڕەجەب ئەلبیومی باسی دەکات، سروشتی وابوو:"ڕەوشتی پارێزگاریی لەناو خێزانەکەیدا پەرە پێدەدا، پێشنوێژی بۆ ئەندامانی خانەوەدەکەی دەکرد لە نوێژی خەوتنان و بەیانی، و شەوانی ڕەمەزانیش سەحیحی بوخاری دەخوێندەوە بۆیان، و شەونخونی دەکرد بۆ ڕۆشنبیر کردنی منداڵەکانی، و ڕاهێنانیان لەسەر سونەتەکانی نوێژ و ڕۆژ و زەکات، و خۆشویستنی چاکە، و دوور کەوتنەوە لە خراپە"

دەراز لە منداڵییدا قورئانی لەبەرکرد کە هێشتا نەگەیشبووە دە ساڵی، پاشان لەگەڵ خانەوادەکەی چوونە ئەسکەندەرییە ساڵی ١٩٠٥، کاتێك شێخ محمد عەبدە داوای لە شێخ عبدالله دەرازی باوکی کرد بۆ دامەزراندنی پەیمانگایەکی ئەزهەریی لەوێ. دەرازی لاو چووە ئەو پەیمانگایەی باوکی بەڕێوەبەری بوو، و بڕوانامەی وانەکانی سەرەتایی لێوەرگرت ساڵی ١٩٠٨.

دواتر ئەم خانەوادەیە چوون بەرەو تەنتا، و شێخ عبدالله دەراز دەستی کرد بە وانە وتنەوە لە مزگەوتی ئەحمەدیی، و ئەو ئەزمونی وانە وتنەوە نوێیەی بە ڕێکاری نوێ لە ئەزهەر پەیڕەویان دەکرد، گواستیەوە بۆ تەنتا.لەو مزگەوتەش محمد وانەی ناوەندی وەرگرت ساڵی ١٩١٢. پاشان شێخ عبدالله و خانەوادەکەی گەڕانەوە بۆ پەیمانگا ئەزهەرییەکەی

ئەسکەندەرییە، و لەو پەیمانگایە محمد بڕوانامەی جیهانیی وەرگرت بە سەرکەوتوویی و پلەی نایاب لەناو هاوپۆلەکانی.

یەکەم ئەزمونی وانە وتنەوەشی دەستپێکرد لە هەمان پەیمانگا دوای دەرچوونی، ساڵی ١٩١٦، و تەمەنیشی لە سەرەتای دەیەی دووەمی تەمەنییەوە بوو. لەگەڵ خوێندنی لە پەیمانگا، محمد خویدابووە فێربوونی زمانی فەرەنسی لە خوێندنگە ئێوارانەکان، بەجۆرێك توانی بەتەواوی فێری ببێت لە ماوەی ٣ ساڵدا، و بڕوانامەی زمانی فەرەنسیشی وەرگرت بە پلەی نایاب ساڵی ١٩١٩.

خوێندنی زمانی فەرەنسی سودێکی کرداریی باشی پێگەیاند، کاتێك تێکەڵ بوو بە بزاوتی نیشتمانیی ڕزگارییخوازی لەدەست داگیرکەری بەریتانی لە میسر، کۆتایی بیستەکانی سەدەی بیستەم، چوون بە زمانی فەرەنسی وتاری دەدا لە بەردەم باڵیۆزخانە و قونسولگەرییەکانی وڵاتانی بیانی لە میسر، و داوای سەربەخۆیی میسری دەکرد لە چنگی بەریتانیا، ئەمەش لەناو جوڵانەوەیەکی گەنجانەی نیشتمانیی میسری بوو ساڵانی ١٩١٨-١٩١٩. هەروەك زمانی فەرەنسی سودی پێگەیاند لەڕوی زانستییەوە کاتێك چووە زانکۆی سۆربۆن لە فەرەنسا ماوەیەکی زۆر دواتر.

دەراز چوو بۆ قاهیرە، بۆ کارکردن لە زانکۆی ئەزهەر، ساڵی ١٩٢٨، لەوێ شێخی ئەزهەر موستەفا ئەلمەراغی کردییە مامۆستای

خوێندنی باڵا و دواتر خوێندنی پسپۆڕیی، پاشان کۆلێژە ئەزهەرییەکان. ناوی دەراز و توانای، پێشبڕکێی لەگەڵ کەسانێك دەکرد کە تەمەنیان لەو زیاتر بوو، و لەویش زیاتر لە دامەزراوەی ئەزهەر دا بوون.

ساڵی ١٩٣٦ دەراز گەشتی حەجی ئەنجامدا، و کاتێك گەڕایەوە بەخششی خوێندنی پاشا فوئادی وەرگرت بۆ خوێندن لە زانکۆی سۆربۆنی فەرەنسی. بەو هۆیەوە ١٢ ساڵ لە فەرەنسا مایەوە، و هەمووی هەوڵ و کۆشش بوو، بۆ تێگەیشتن لە ڕۆشنبیری و ڕەوشتی ڕۆژاوایی لە سەرچاوە ڕەسەنەکانییەوە، و بۆ بیرکردنەوەی بەراوردکارییانە لە دەرئەنجامەکەی و پرنسیپەکانی ڕەوشت لە قورئان دا.

دەراز بڕوانامەی لیسانس و دکتۆرای دەوڵەتی وەرگرت لە زانکۆی سۆربۆن، و تێزی دکتۆراکەی کە ناوی"ڕەوشتی قورئان" بوو، جێی سەرسامیی گەورە ڕۆژهەڵاتناسانی فەرەنسی و سەرپەرشتیکاریی بوو، لەوانەش: لویس ماسینیون و لیفی پرۆفنسال. و گفتوگۆی تێزەکەی مێژووی ١٩٤٧/١٢/١٥ بوو.

دوای ئەم گەشتە زانستییەی، و گەڕانەوەی بۆ میسر، دەراز بووە ئەندامی دەستەی باڵای زانایان ساڵی ١٩٤٩. هەروەك بووە وانەبێژ لە چەند بەشێکی زانستیی زانکۆکانی میسر. لەوانەش: بابەتی (مێژووی ئاینەکان)ی کۆلێژی ئاداب، و بابەتی (ڕاڤەی

قورئان)ی کۆلێژی دارالعلوم، و بابەتی (فەسلەفەی ڕەوشت)ی کۆلێژی زمانی عەرەبی، و چەند بابەتێکی جیاوازیشی دەوتەوە لە کۆلێژی سەربازی. هەروەك بارەگای برایانی موسوڵمان (الاخوان المسلمین)ی کردبووە شوێنی وانە وتنەوەی، و لەوێ نەدوە و دیبەیت و کۆنفرانسی هۆشیارکردنەوەی ئەنجام دەدا.

لەگەڵ ئەندام بوونی لە دەستەی باڵای زانایان، دەراز لە چەند دەستە و لیژنەیەکی ڕۆشنبیری و زانستیی میسر کاری دەکرد، لەوانە:

- لیژنەی باڵای ڕێوشوێنەکانی فێرکردن لە وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن.
- ئەنجومەنی باڵای بڵاوکراوەکان.
- لیژنەی ڕاوێژکاریی ئەزهەر.
- لیژنەی ڕاسپێرراو بە چاودێریی تاقیکردنەوە گشتییەکان لە ئەزهەر.

هەروەها دەراز بەشداریی چەندین کۆنگرەی نێودەوڵەتی کردووە، لەوانە:

- کۆنگرەی نێودەوڵەتی ئایینەکان لە پاریس، ساڵی ١٩٣٩.
- کۆنگرەی نێودەوڵەتی زانکۆکان لە شاری نیس لە فەرەنسا ساڵی ١٩٥٠.
- کۆنگرەی یاسادانانی ئیسلامی لە پاریس ساڵی ١٩٥١.

- کۆنگرەی ڕۆشنبیری ئیسلامی لە پاکستان ساڵی ١٩٥٨.

لەم کۆنگرەیەی کۆتاییدا، دەراز کۆچی دوایی کرد لە شاری لاهوری پاکستان ساڵی ١٩٥٨، بەهۆی جەڵدەی دڵەوە، پێش ئەوەی کۆڵینەوەکەی پێشکەش بکات، کە ناونیشانەکەی:"هەڵوێستی ئیسلام لە ئایینەکانی دی و پەیوەندیی لەگەڵیان". خەفەت بە ئامادەبوانی کۆنگرەکەوە دیار بوو، و کۆڵینەوەکەی ئەم زانایە خوێنرایەوە دوای ئەوەی خۆی دنیای جێهێشت، و لاشەی پیرۆزیان بردەوە بۆ میسر، و لەوێ ژمارەیەکی زۆر لە مزگەوتی ئەزهەر نوێژیان لەسەری کرد، و خەڵکانێکی زۆر لەگەڵی ڕۆشتن بەرەو کۆتا مەنزڵی دنیای. هەروەك کەڵەزانایانی میسر و جیهانی ئیسلامی پەژارەیان دەربڕی بۆ کۆچکردنی، لەوانەش شێخ محمود شەلتوت کە وتی:"ئەو مەشخەڵی ڕوناکییە کۆچی دوایی کرد کە مەشخەڵی نەفامییەکانی کوژاندبۆوە".

دەراز پێنج کوڕ و پێنج کچی هەبوو. یەکێك لە کوڕەکانی فڕۆکەوانی سەربازیی شەهید (صەفوەت دەراز) بوو کە لە شەڕی دژی ئیسرائیل شەهید کرا ساڵی ١٩٥٦، و باڵیۆزی خانەنشین (فەتحی دەراز)، و دکتۆری نەشتەرگەریی (سەعید دەراز)، و (دکتۆر محسن) کە ڕەگەزنامەی فەرەنسی هەبوو، و (سامی) کە وەرگێڕە و نیشتەجێی فەرەنسایە. پێنج کچەکەشی ناویان (فەتحیە، سوعاد، ئیحسان، صەفیە، سامیە) بوو.

**تایبەتمەندییە کەسییەکانی**

**هاوڕێ و دۆستەکانی دەراز، کۆکن لەسەر ئەوەی چەند تایبەتمەندیی و خەسڵەتێکی هەبوو کە بەڵگە بوون لەسەر دەرونپاکی، و بەهێزیی کەسایەتیی، و گەشاوەیی ڕوحیی، و بەتوانایی هزریی. شێخ عبدالله ئەلئەنساری، بوارەکانی کەسایەتیی دەرازی پوخت کردۆتەوە لە: بەئاگایی، زیرەکیی، هێمنیی، لەسەرخۆیی، خۆبەکەمزانیی، بەئەمەکیی، بوێریی، پێشەنگیی، جوامێریی، سوربوون لەسەر حەق، لێهاتوویی قسەکردن، خۆشیی هاوڕێیەتیی.**

**هەروەك شێخ حسنین مەخلوف لە وەسفیدا دەڵێت:"کەسایەتیی دەراز وابوو زوو هۆگری دەبوویت و هۆگرت دەبوو، خۆشەویست و میهرەبان، بە خۆشەویستی ڕێنمایی دەکرد، هەروەك بە بەڵگەهێنانەوەی تێیدەگەیاندیت. کەسایەتییەکی لەسەرخۆ بوو، باوەڕێکی پتەوی هەبوو، خۆی دەپاراست لە دنیا و خۆشییەکانی، بە ویردەکانەوە سەرقاڵ بوو، کاتێك بە تەنها بتبینیایە یان ویردەکانی دەخوێند یاخود قورئان".**

**هەروەها دەڵێت:"کەسایەتیی دەراز نمونەیی بو لە هەستی ناسك، و سۆزی مەردانە، و نمونە بوو بۆ ئارامیی لە بێمنەتیی دا، و ئۆخژنیی لە خۆبەکەمزانیی، و شەرمنیی بە ڕێزێکی زۆرەوە...کاری بۆ ئیسلام دەکرد بە بێدەنگی، بەشێکی زۆر لە کات**

و كۆشش و تەندروستی خۆی بەخت دەکرد لەپێناویدا"ئێمەش لێرەدا ڕەنگدانەوەکانی ئەو تایبەتمەندییانە تۆزێك بە وردی باس دەکەین.

دەراز نەفسی بەرز بوو، خۆی لە شتی بچوك و بێنرخ دەپاراست، بەهای ئەو پەیامە قورئانییەی دەزانی کە هەڵیگرتبوو. نەهامەتییەکانی جەنگی جیهانی دووەم و داگیرکردنی فەرەنسا لەلایەن ئەڵمانیای نازییەوە، ساردی نەکردەوە لە خوێندن و کۆششەکانی، و چاودێریی کردنی خانەوادەکەی-کە پێکهاتبوو لە خێزانی و دە منداڵەکەی- بە هەموو میهرەبانییەك.

موحسینی کوڕی دەگێڕێتەوە باوکی چەند جارێك پێشنیازی باڵیۆزخانەی میسر لە پاریسی ڕەد کردۆتەوە بۆ گێڕانەوەی بۆ میسر، خۆی و خانەوادەی، بەهۆی هەبوونی مەترسی لەسەر ژیانیان، و هەمیشە دەیوت:"جارێ کارەکەم تەواو نەبووە". دەراز قایل نەبوو بە گەڕانەوەی بۆ میسر پێش ئەوەی خوێندنەکەی تەواو بکات، ئەگەرچی ناچار بوو خانەوادەکەی بنێرێتەوە بۆ میسر دوای ئەوەی هاوسەرەکەی بریندار بوو لە موشەکبارانی ئەمریکی بۆ فەرەنسای داگیرکراو ڕۆژی ١٩٤٨/٦/٨.

یەکێك لە ئاماژەکانی ئازایەتیی و نەفس بەرزیی دەراز، ئەوەبوو، کاتێك دەسەڵاتی فەرەنسی داردەستی ئەڵمانی هەندێك

قوتابی میسرییان دەستگیر کرد، ئەو-لەو کەشە مەترسیدارەدا-چوو بۆ لای سەرکردەی پۆلیسی ئەڵمانی و گفتوگۆیەکی دورودرێژی لەگەڵ کرد تا قەناعەتی پێکرد بۆ ڕزگار کردنی هاوڕێکانی. یەکێکیتر لە ئاماژەکانی، پشتگیریی کردنی ئاشکرای-لە کاتێکدا خۆی خوێندکار بوو لە فەرەنسا- بزاوتەکانی ڕزگارییخوازیی ڕۆژاوای عەرەبی بوو کە فەرەنسا داگیری کردبوون، و هاوکاریی ئاشکرای سەرکردەی بزاوتەکانی دەکرد، لەکاتێکدا دەسەڵاتی فەرەنسی هەموو جۆرە بەرگریکردنێکی داگیرکارییەکانی بە تیرۆرێکی ئیدانەکراو هەژمار دەکرد.

کاتێك گەڕایەوە بۆ نیشتمانەکەی، دەستیکرد بە دژایەتیی داگیرکاریی بەریتانیی، و پشتگیریی سەربەخۆیی دەکرد، بە پێنوس و زمانە پاراوەکەی کەوتە هاندان بۆ بەرگریکاریی چەکداریی دژی داگیرکەر.

ئازایەتیی و نەفس بەرزییەکەی لە بەرامبەر سەرکردە لۆکاڵییە بێدەسەڵاتەکان هیچی کەمتر نەبوو لە ڕوبەڕوو بونەوەی هێزە بیانییەکان. ماوەیەکی کەم پێش ئینقیلابی ئەفسەرە ئازادەکان لە ساڵی ١٩٥٢، دەراز نامەیەکی نوسی بۆ پادشا، و تیایدا هەندێك لە دیاردە نەرێنییەکانی ناو دەسەڵاتەکەی بۆ ڕونکردەوە، لەگەڵ کاریگەرییان لەسەر وڵات.

دەراز بە زویی سەرنجی ئەفسەرە ئازادەکانی ڕاکێشا، بەهۆی بەرنامە قورئانییەکانی کە لە ڕادیۆ پەخش دەکرا، بۆیە پێشنیازی باڵاترین پلەی ئاینییان بۆ کرد لە میسر دا، کە بریتییە لە شێخی ئەزهەر. لێرەدا ڕەسەنایەتیی ناخی دەراز و ڕاستگۆیی، دەرکەوت، و وەك هەندێك کەسیتر یەکسەر نەچوو بەرەوپیری ئەم پێشنیاز و هەلە، بێ گوێدانە دەرهاویشتەکانی، بەڵکو مەرجی ئەوە بوو کە ئەزهەر سەربەخۆیی ئەکادیمیی هەبێت لە دەسەڵات، و دەستی ئاوەڵا بێت لە ئەنجامدانی هەندێك چاکسازی گرنگ و پێویست لە دامەزراوەکەدا. کاتێك دەسەڵاتدارە سەربازییە نوێیەکانی میسر قایل نەبوون، ئەویش داوای لێبوردنی کرد لە وەرگرتنی ئەو پۆستە، و سوربوو لەسەر ڕەدکردنەوەی لەگەڵ ئەوەی چەندینجار هەوڵیان لەگەڵ دا و پێشنیازی بۆ کرا.

ڕەنگە چاونەترسترین هەڵوێستی لە ڕووی سیاسییەوە ئەوە بێت کە ئامادە نەبوو واژۆ بکات لەسەر ئەو بڵاوکراوانەی دەسەڵاتی جمال عبدالناصر بڵاوی دەکردەوە لەڕێی هەندێك لە زانایانی ئەزهەر و دەستەی باڵای زانایان لە میسر، و تیایدا وەسفی کۆمەڵەی برایانی موسوڵمان (الاخوان المسلمين) دەکرا بەوەی"خەواریجن و تەوبەیان لێ قبوڵ ناکرێت و شەفاعەتیان بۆ ناکرێت" لەکاتێکدا گیانی خەڵکانێکی وەك: یوسف تەلعەت و

محمد فەرغەلی و سەید قوتب و عبدالقادر عۆدە... بە لەسێدارەدان بەرز دەبۆوە بەرەو ئاسمان....شێخ مصطفى فضلية لە فەتحی دەراز-کوڕی شێخ محمد عبدالله دەراز-ەوە دەگێڕێتەوە کە باڵیۆز بوو، کاتێك یەکێك لەو بڵاوکراوانەیان بۆ هێنا، بە هەڵگرەکەیی وت:"چۆن دەتەوێت واژۆ لەسەر بڵاوکراوەیەك بکەم بۆ ئیدانە کردنی موسوڵمانان"

دەراز لە هەر شوێنێك بووایە، هەڵگری خەمی ئوممەتی ئیسلامیی بوو. دەربارەی ئەمە شێخ (يوسف القرضاوي) دەڵێت:"هەرکات دانشتویین لەگەڵی و قسەمان لەگەڵ کردووە، هەمیشە سەرقاڵی کاروباری ئیسلام و موسوڵمانان بوو". یادەوەرییەکانی دەراز بەڵگەی ئەم گیانی ئەرێنیی و گەشبینییەیە کە بێزار نابێت لە هەڵگرتنی خەمی ئوممەت و خزمەتکردنی ئاتاجان.

مەنهەجییەتی هزری

دەراز "کوڕی ئەزهەر، و کوڕی سۆربۆن" وەك شێخ (يوسف القرضاوي) ناوینا. کۆڵینەوە قوڵەکانی لە ڕۆشنبیری ئیسلامی و ڕۆشنبیری ڕۆژاوا، لە سەرچاوە ڕەسەنەکانیانەوە، دیدێکی فرەڕەهەندی شیکاریی ناوازەی پێدا، دور لە ڕووکەشیی و ئاسانیی، و دور لە "هەرسنەکردنی عەقڵیی" کە زۆرێك دوچاری هاتن، لەوانەی لە سنوری میراتی ڕۆشنبیری وەستاودا ڕاوەستان

یاخود له سنوری ڕۆشنبیری هاتووی ڕۆژاوا و دوو مەنهەجەکەیان جودا کردەوە. خۆ ئەگەر هەستانەوەی جیهانیی پێویستی بە"دڵێکی ڕۆژهەڵاتی و هزرێکی ڕۆژاوایی" بێت وەك ئیقبالی فەیلەسوف و شاعیر دەڵێت، ئەوا گومانی تێدا نییە دەراز کۆکەرەوەیەکی نایابی هەردوکیان بوو. ڕۆچوبوو لە ڕۆحانیاتی (الغزالی و الحکیم و الترمذي و ابي طالب المکی)، بەئاگا بوو لە فەلسەفەی "دیکارت و کانت و بێرگسون". بەهۆی ئەم هزرە فرەڕەهەندەوە، ئاسۆی فراوان بوو، و شیکاریی قوڵ بوو، بەڵگەهێنانەوەی ورد و بەجێ بوو، لەگەڵ بەڵگەی باوەڕپێکەر، و ڕەوانبێژییەکی ئەفسانەیی کە لە ڕەوانبێژیی قورئانەوە هەڵیهێنجابوو. وێنەی دەراز لە وەرگرتن و تێگەیشتنی ڕۆشنبیری ڕۆژاوا-لەگەڵ دوریەکەی لە وەحی قورئانییەوە- و ڕۆشنبیری ئیسلامی-بەو هەموو خڵتەیەی بەدرێژایی چەند سەدەیەك تێکەڵی بوو بوو- و خۆ دەوڵەمەندکردن پێیان...وەك وێنەی هەنگ بوو، لە هەموو بەرهەمەکان دەخوات بە جیاوازیی تام و بۆن و ڕەنگیان، پاشان لەناوخۆیدا دایدەڕێژێتەوە بەشێوەی شیلەی هەنگوین.

دەراز خاوەنی هزرێکی بابەتیی بێلایەن بوو. لە گرنگترین کتێبی دا"دستور الاخلاق في القران" گفتوگۆی هزرە ئەخلاقییە گەورەکان دەکات سەبارەت بە پابەندکردن و بەرپرسیارییەتی و

سزا و کۆشش و پاڵنەر لە کەلەپوری ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا، و لەبێژنگی دەدات بە هزرە فراوانەکەی، پاشان بە بۆچونێکی بێلایەنەوە لێی دەردەچێت، کە بەڵگەی ڕەسەنیی و فراوانیی زانستییەتی. هەمان مەنهەجی گرتۆتەبەر لە کتێبی "الدین" و کۆڵینەوەکانی تریشیدا کە شێوازێکی بەراوردکارییان تێدایە.

ئەو بێسەروبەرییەی لە ناوجەرگەی ئەورووپا، دەراز بینی، وای لێنەکرد گومانی خراپ ببات بە ژیاری مرۆڤایەتی، یاخود هاوسەنگییەکەی لاسەنگ بکات لە هەڵسەنگاندنی کلتوری ڕۆژاوا و بەخششەکانی، و موحسینی کوڕی دکتۆر محمد دەراز دەڵێت"هەرگیز بە هزری دا نەهاتووە کە تێکەڵی بکات لەنێوان سیاسەتی مرۆڤ و دەوڵاتان لەگەڵ پایەکانی ژیاری ڕۆژاوا دا". ئەمەش ئەگەر بەڵگەبێت لەسەر شتێك ئەوا بەڵگەیە لەسەر باڵایی هزری دەراز و هاوسەنگی بڕیاردانی.

دەراز ئەویندار‌ی زانست بوو بە تەواوی واتا. بۆیە ئارامیگرت لەسەر نامۆیی، و بەدەستهێنانی زانست لە بارودۆخی نالەباری جەنگ، و هەمیشە بەنرخترین خەزێنە لای وی بریتی بوو لە ڕەشنوسی تێزی دکتۆراکەی. دکتۆر موحسینی کوڕی دەڵێت کە هەرکات جەرەسی ئاگادار کردنەوەی بۆردومانی پایتەختی فەرەنسا لێبدرایە، دەراز دەبینرا"فایلێکی ئەستوری کاغەزی دەستنوسی دەگرت بە باوەشیەوە کە بریتیی بوو لە تازەترین

بەشەکانی تێزی دکتۆراکەی داهاتووی". ئای ئێستا ئێمە چەندێك قەرزاری دەرازین بۆ ئەو خۆپارێزییە! خۆ ئەگەر ئەو دەستنوسانە لەناوبچونایە ئەوا ئەو بیرکردنەوە و تێفکرینە قورئانییە جوانانەمان لەدەست دەچوو کە لە کتێبی "دستور الاخلاق فی القران" دایە.

ڕەنگە یەکێك لە گرنگترین خەسڵەت و سەرچاوەکانی کەسایەتی محمد عبدالله دەراز، کە هەموو زانست و زانیارییە هزری و کردارییەکانی لێهەڵێنجاوە بریتیی بێت لە هۆگریی قورئان. دەراز پیاوی قورئان بوو بە پلەیەکی نایاب، خۆشەویستیی قورئان هەموو هۆش و جۆش و دڵ و هزری داگیرکردبوو، و کتێبی خودا هەموو کارێکی بوو، و نەدەبینرا مەگەر خەریکی خوێندنەوەی و بیر لێکردنەوەی بوو، یاخود لەنوێژدا دەیخوێند. بە بەردەوامی شەش بەش (جزء )ی لێدەخوێند ڕۆژانە، بێ ماندوو بوون و بێزار بوون. قورئانی زۆر بەگەورە دەگرت، کاتی ڕاڤە کردنی کە دەگەیشتە کڕنوشی قورئان خوێندن (سجدة التلاوة) کڕنوشی دەبرد، و داوای لە قوتابییەکانی دەکرد کە بە دەستنوێژەوە بێن بۆ وانەکەی.

شێخ محمد ئەبو زەهرە، هاودەمی کۆتا گەشتی بۆ کۆنگرەی ئیسلامی لە لاهور، دەڵێت:"لە نوێژی خەوتنان پێشنوێژی بۆ دەکردین، و دواتر هەریەك لە ئێمە دەچووە ناو جێگەی نوستن،

بەڵام ئەو دەچوو بە لای نوێژ و قورئانەکەی. نەدەبینرا مەگەر یا قورئانی دەخوێند یاخود نوێژی دەکرد". هەروەك شێخ (یوسف القرضاوي) قوتابی وی دەربارەی نوسیویەتی:"دەرازی مامۆستامان لە مامۆستا خواویستەکان بوو، هەمیشە پەیوەست بوو بە خودای گەورەوە...هەرکات دەچووین بۆماڵیان دەمانبینی خەریکی قورئان خوێندن بوو بە لەبەرکردن بەهۆی بەتوانایی لە لەبەرکردن، بە خوێندنی پەرستشی ئەنجام دەدا، و کاتەکانی لێوانلێو بوون لە یادی خودا، یاخود چاکە کردن، یاخود خزمەتکردنی زانست".

سەرجەم گرنگیی پێدانە زانستییەکانی تەنها بۆ قورئان بوو، و ڕەنگە کارێکی نەبێت جا کتێب یا تێز یاخود وانە یان ستونێك مەگەر قورئان خولگە و کرۆکیەتی. بەجۆرێك ئەو بابەتانەی کۆڵینەوە قورئانییەکانیش نایانگرێتەوە بەو جۆرە نوسینانەی باون، دەبینیت دەراز لە دیدگای قورئانەوە قسەی لەسەر کردووە. ئەو نەیدەتوانی ئەوین و پەیوەستیی دڵی بە کتێبی خوداوە کەم بکاتەوە، و شوێن وشە قورئانییەکان دەکەوت بەشێوازی کەسێك کە شتێکی زۆر گرانبەهای لێ ون بووبێت، و بەڕاستییش وەسفیان دەکات بە "دەنکە مرواری".

شێوازی نوسینی

شێوازی نوسینی دەراز دەناسرێتەوە بە قوڵیی و ڕاستگۆیی، ئاسانیی وەرگرتن، و جوانیی داڕشتن، و دوریی لە زۆرلەخۆ کردن جا لە ڕووی وشەکاریی یاخود واتاوە. ئەم سەرقاڵییە بەردەوامەی بە کتێبی خوداوە، درەوشانەوەی ڕوح و دەروونی پێدا بەجۆرێك هەرکەسێکی وریا نوسینەکانی بخوێنێتەوە، هەستی پێدەکات.

دکتۆر (عبدالستار فتح الله سعید) بەراوردێك دەکات لەنێوان دکتۆر محمد عبدالله دەراز و شەهید حەسەن بەننا سەبارەت بەم دەروشاوەییە، و دەگاتە ئەوەی وشەکانیان"وەك شەپۆلێکی ڕوناکیی روحیی تێکەڵ بە دڵ و ئاوەزم دەبن...و لە دەرونمدا لێدانێك دەوروژێنێت کە بەرزی دەکاتەوە بەرەو لای خودا"، و پاشان ئەمەش بەوە ڕاڤە دەکات کە"خودا هێزێکی روحیی و خۆشەویستیی داوە بەم دوو زانایە، بۆیە بەرهەمەکانیشان بە هەمان شێوەی ناخیانە لە درەوشانەوەی روح، و توانەوەی دەرون، و گوشراوی دڵ... بۆیە ئەم بەرهەمانەیان زۆر بە ئاسانیی و سانایی دەچێتە ناو دڵ و روحەوە".

پێدەچێت زۆر خوێندنەوە و بیرلێکردنەوەی کتێبی خودا هۆکاری ئەو شێوازە قورئانییە ناوازەیەی نوسینی دەراز بێت، و هەر کەسێك نوسینەکانی بخوێنێتەوە ئەو ڕستە و وشە قورئانییانە دەبینێت وەك مرواری بڵاو بوونەتەوە بەناو وتەکانی دا، هەروەك ئەوەی کە ئەم پیاوە سەرجەم نوسینەکانی بووبێتە

بەکارهێنانی قورئان و دەربڕینە قورئانییەکان، بۆیە شێوازی نوسینی دەراز شێوازە نایابە قورئانییەکانی لێدەچۆڕێت. لێرەدا چەند نمونەیەکی لێ دەهێنینەوە، و ئەو دەربڕینانەی کە دیارە کاریگەربووە بە قورئان بە تۆخی دەینوسین تا دیار بێت:

- "فذلك مثل الوحي و متلقيه (صلى الله عليه و سلم): هذا بشر مطواع ذو روح صاف يقبل انطباع العلوم فيه، و ذلك ملك **شديد القوى ذو مرة**..."..

- "**والله يأتى بالشمس من المشرق، فمن ذا الذي يأت بها من المغرب**؟...هل يستطيع الناس جميعا ان يأتوا بالشمس قبل وقتها...**و لو كان بعضهم لبعض ظهيرا**؟"

- أرأيت هذه المراحل الأربع التي سلكها القرآن في دعوة بني اسرائيل...**فارجع البصر كرة** أخرى إلى هذه المرحلة الأخيرة منها، لتنظر كيف استخدم {القرآن} موقعها هذا لتحقيق غرضين مختلفين... فالتقى المقصدان **على امر قد قدر**...**حتى صار كل من ألقى إليها سمعه** إليها مليا يسمع في طياتها **نداء خفيا**...ألا ترى الميدان قد اصبح خاليا من تلك الاشباح الاسرائيلية التي كانت تتراءى لك في ظلام الباطل تهاجمها و تهاجمك؟ **هل تحس منهم من احد او تسمع لهم ركزا**؟"

- "إن التكذيب بما لم **يحط الإنسان بعلمه، و لما يأته تأويله،** خطأ لا يرتكبه **الراسخون في العلم** و الدين، و إنما يقع فيه المغرورون من العامة او أنصاف المتعلمين"

- "و أما الجاهلون الذين أوتوا قليلا **من علم ظاهر الحياة،** فظنوا أنهم **أحاطوا بكل شئ علما،** فإنهم سيكذبون بكل **ما لم يحيطوا بعلمه...**"

- "**فمثلهم كمثل الذي** يرى تفرق منابع الانهار في الارض، و لا يذكر ان مردها جميعا الى أصل واحد، **هو الماء الذي انزله الله من السماء فسلكه ينابيع في الارض**"

- "و أنت **فهل عسيت** أن يخالجك شئ من الشك في مدى حاجة الجماعة في مختلف الامم و الشعوب الى ازدهار هذا الروح الديني فيها"

جا باس كردنی سەرجەم هاوشێوەكانی ئەم جۆرە كە دەراز لە نوسینەكانیدا دایڕشتوونەتەوە بە زمانێكی عەرەبیی قورئانیی، كارێكی قورس و گرانە. هەروەك ئەو كتێبانەشی بە فەرەنسی نوسیونی و وەرگێڕدراون بۆ عەرەبی وەك "دستور الاخلاق فی القران" و "المدخل الی القران"، وەرگێڕەكان كاریگەر بوون بە شێوازە قورئانیی ئاساكەی دەراز، بۆیە وەرگێڕانەكانیان هەندێكجار ئاماژەی جۆراوجۆری ئەو شێوازەی تێدایە.

ئەنوەر الجندی بەباشی تێبینی ئەوەی کردووە کە شێوەی نوسینی دەراز لە کتێبەکانیدا"کەم وێنەیە لە کۆڵینەوە ئیسلامیی و ئەزهەرییەکان دا، لە ڕووی خۆ لادان لە دەربڕینی بریق و باق، یاخود درێژبڕی و کورتبڕی، یاخود داڕشتنێکی زیاد لە پێویست. بەڵکو دەربڕینەکانی تۆکمەن بەپێی واتاکانی، و نوسینێکی تۆکمە، کە دڵ و ئاوەز پێکەوە خۆش دەکات".

زمانی عەرەبیی دەراز دەناسرێتەوە بەوەی زمانێکی ڕەونەقدارە، ڕەسەنایەتیی زانایانی اصول و ڕوونی ئەدیبانی لەخۆ گرتوە، ئەمە بۆ زمانە فەرەنسییەکەیشی ڕاستە. دەگمەنە نوسەرێك ببینیت بتوانێت بە دوو زمان بنوسێت هێندە بەتوانا بێت و قەڵەمەکەی بەبڕشت بێت. وەرگێڕی کتێبی "مدخل الی القران الکریم" (محمد عبدالعظیم) تێبینی ئەوەی کردووە دەراز:"زمانە فەرنەسییەکەی و ئاستی نوسینەکانی گەیشتۆتە ئاستی ئەدیبێکی فەرەنسی لە ئاستی زۆر باڵا. زمانە فەرەنسییەکەی دەناسرێتەوە بە جوانی و بەبڕشتی، و ڕوونی هزری...و وردی لە ڕووی هەڵبژاردنی دەربڕین و دەستەواژەکان، لەگەڵ دەوڵەمەندییەکی بێ سنور لە وشە و هاوواتاکان".

باسکردنی بەرهەمەکانی

شێخ دەراز لەو کەسانە نەبوو کە زۆر بنوسێت، چوون جۆر لای وی گرنگتر بوو لە بڕ، بۆ بواری نوسینی هزریی. بەڵام ئەوەی

نوسیویەتی زیاد کردنێکی نمونەییە بۆ هزری قورئانیی و ئیسلامیی کە ئێمە زۆر پێویستمان پێیەتی لەم ڕۆژگارەدا. لێرەدا باسێکی خێرای نوسین و چاپەکانی دەکەین:

١- "دستور الأخلاق في القرآن الكريم: دراسة مقارنة للأخلاق النظرية في القرآن": دکتۆر (عبدالصبور شاهين) کردوویەتی بە عەرەبی و هەندێك تێچێنیشی لەسەر نوسیوە. لە بنەڕەتدا تێزی دەراز بوو بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا لە فەلسەفە لە زانکۆی سۆربۆن. (دار المعارف) نوسخە فەرەنسییەکەی بڵاوکردەوە لە قاهیرە ساڵی ١٩٥٠. (دار البحوث العربية) بە عەرەبی بڵاوی کردۆتەوە لە کوەیت ساڵی ١٩٧٣، پاشان (دار البحوث العربية) لەگەڵ (دار الرسالة) لە بەیروت دووبارە بڵاوی کردۆتەوە لەنێوان ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٩١. هەروەك وەرگێڕدراوە بۆ زمانی ئینگلیزی و I.B. Tauris بڵاوی کردۆتەوە ساڵی ٢٠٠١ لەژێر ناونیشانی: "عالم الأخلاق القرآنية".

٢- "مدخل الى القرآن الكريم: بحث تأريخي و تحليل مقارن". کە نامەی ماستەرەکەیەتی لە زانکۆی سۆربۆن. کتێبەکە بە فەرەنسی لەلایەن (دار المعارف)ەوە چاپ کراوە ساڵی ١٩٤٩ پاشان لەلایەن چاپخانەی زانکۆی فەرەنسییەوە چاپ کراوە ساڵی ١٩٥١. پاشان پوختەیەکی فەرەنسی لە لایەن (دار الفلاح)ەوە چاپ کرا ساڵی ١٩٩٧ بە پێنوسی (محمد عبدالعظيم علي)، و هەر ئەویش

کتێبەکەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی. ئەو خانەی چاپانەی بە عەرەبی بڵاویان کردۆتەوە: دار القلم لە کوەیت ساڵی ١٩٧١. و وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەیشی لەلایەن I.B. Tauris بڵاو کراوەتەوە لە لەندەن ساڵی ٢٠٠١.

٣- "النبأ العظيم: نظرات جديدة في القرآن": دەراز لە نوسینی تەواو بوو ساڵی ١٩٥٧، و سیانزە چاپی لێدەرچوو لانی کەم، لە لایەن چاپخانەی (السعادة)ی میسر ١٩٦٠ و ١٩٦٩، و دار (القلم) لە کوەیت ١٩٧٠ و ١٩٧٧ و ١٩٩٦، و دار (الثقافة)ی قەتەر ١٩٨٥، دار (طيبة)ی ریاض ١٩٩٦، دار (المرابطين) لە ئەسکەندەرییە ١٩٩٧. هەروەك چاپێکی بە ئینگلیزییش دەرچوو لە وەرگێڕانی (عادل صلاحی) بە ناونیشانی"القرآن: تحدٍ أزلي" لەلایەن دامەزراوەی ئیسلامی لە لەندەن ساڵی ٢٠٠٧.

٤- "الدين: بحوث ممهدة لدراسة تأريخ الأديان": کە لە بنەڕەتدا پوختەی وانەکانی دەرازە سەبارەت بە مێژووی ئاینەکان لە زانکۆی (فؤاد الأول). لە لایەن (المكتبة العالمية) لە قاهیرە بڵاو کرایەوە ساڵی ١٩٥٢، و دار (القلم) لە کوەیت ساڵانی ١٩٧٠ و ٢٠٠٣، و (دار المعرفة الجامعية) لە ئەسکەندەرییە ساڵی ١٩٩٠. وەرگێرانی فەرەنسیشی بڵاو کرایەوە لەلایەن دار (البراق) لە پاریس ساڵی ١٩٩٩ بە ناونیشانی:"الناس في بحثهم عن الله: مقدمة في تأريخ الأديان".

٥- "الميزان بين السنة و البدعة" ئەمەیان کتێبێکە کە دەراز ویستی درێژکراوەی کتێبی "الاعتصام"ی الشاطبي بێت، و کۆکراوەی وانەکانیەتی بۆ قوتابیەکانی، ساڵی ١٩٤٣. بەڵام وا دیارە دەرفەتی نەبوو بۆ ئەوەی کۆتا دارِشتنەوەی بۆ بکات. دار (القلم) لە قاهیرە بڵاوی کردەوە ساڵی ٢٠٠٣ بە پێداچوونەوەی شێخ (احمد فضلیة)وە.

٦- "المختار من كنوز السنة"لە یەکەمین دانراوەکانی دەرازە، و لە بنەرِەتدا وانەکانییەتی دەربارەی فەرمودە بۆ خوێندکارانی کۆلێژی بنەماکانی ئاین لە ئەزهەر. بۆ یەکەمجار لە قاهیرە دەرچوو ساڵی ١٩٣٢، پاشان شێخ عبداللە الانصاری تەحقیقی کرد، و چەند چاپێکی لێدەرچوو لە لایەن دار (الانصار) لە قاهیرە ساڵی ١٩٧٨. پێدەچێت دەراز ویستبێتی بەشی دووەمی کتێبەکە بنوسێت دوای چەند دەیەیەك لە دەرچوونی بەشی یەکەم، بەڵام کۆچی دوایی کرد پێش ئەوەی بتوانێت شتێکی ئەوتۆی لێ بنوسێت.

٧- "من خلق القرآن"کۆمەڵێك وتاری رِادیۆیی دەرازە، لەلایەن دەنگی قاهیرەوە پەخش کراوە، و شێخ (عبداللە الانصاری) کۆی کردوونەوە پێیدا چۆتەوە، و بەرِێوەبەرایەتی کاروباری ئاینیی لە قەتەر چاپی کردووە ساڵی ١٩٧٩.

٨- "و ثيابك فطهر: و لباس التقوى ذلك خير": نامەیەکی دەرهێنراوە لە کتێبی:"من خلق القران"ی دەراز، دار (الانصار) لە قاهیرە چاپی کردووە ساڵی ١٩٧٨.

٩- "في الدين و الأخلاق القومية": لە بنەڕەتدا وتاری ڕادیۆیین، دار (الكتاب العربى) لە قاهیرە چاپی کردووە ساڵی ١٩٦٧، چاپێکی بە زمانی عیبری دەرچووە، ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە هاندانی تیایە بۆ تێکۆشان لە دژی ئیسرائیل.

١٠- "حصاد القلم...مقالات و بحوث للشيخ محمد عبدالله دراز": کە شەست و شەش بابەتی زانستیی دەراز لەخۆ دەگرێت، لە نێوان بیرۆکەیەك کە لە پەڕەیەك تێپەڕ ناکات بۆ کۆڵینەوەیەکی درێژی بناغە داڕێژراو. لە کۆکردنەوە و پێداچوونەوەی شێخ (احمد فضلية)یە، دار القلم بڵاوی کردۆتەوە ساڵی ٢٠٠٤.

١١- "الصوم تربية و جهاد": (الشركة العربية) ساڵی ١٩٥٨ چاپی کردووە، و دار (القلم) ساڵی ١٩٨٠ چاپی کردووە.

١٢- "دراسات إسلامية في العلاقات الدولية و الإجتماعية": ئەم کتێبە پێك دێت لە حەوت کۆڵینەوە و دوو وانە و وتەیەکی پێشکەشکراو لە کۆنگرەیەکدا. دار (القلم) لە کوەیت چاپی کردووە ساڵانی ١٩٧٣ و ١٩٧٤، و دار (المعارف الجامعية) لە ئەسکەندەرییە چاپی کردووە ساڵی ١٩٨٩. پاشان دار (القلم) چاپی

کردەوە لە چاپێکی فراوانکراوی لەبێژینگدراو بە پێداچوونەوەی شێخ (احمد فضلية)وە ساڵی ٢٠٠٣.

١٣- "زاد المسلم للدين و الحياة": کە شەست و چوار وتاری ڕادیۆیی دەراز لەخۆ دەگرێت، شێخ (احمد فضلية) کۆی کردونەوە و پێیدا چووەتەوە، و دار القلم ساڵی ٢٠٠٨ بڵاوی کردۆتەوە.

١٤- "نظرات في الاسلام": (المكتب الفنى) لە میسر بڵاوی کردۆتەوە ساڵی ١٩٥٨، و (مكتبة الهدى) لە حەلەب ساڵی ١٩٧٢، و دار (الارقم) لە بەیروت ساڵی ١٩٧٢. هەروەك وەرگێڕدراوە بۆ زمانی تورکی و ساڵی ١٩٧٧ Husnuhayat Matbaas بڵاوی کردۆتەوە.

١٥- "اصل الاسلام": دەراز بە فەرەنسی نوسیویەتی بەناونیشانی:"ميلاد الاسلام: هل يمكن ان يكون محمد (صلى الله عليه و سلم) هو مؤلف القرآن؟"، و (مؤسسة الرسالة) فەرەنسییەکەی بڵاو کردۆتەوە لە پاریس ساڵی ٢٠٠٦. و پێشتر وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی و بڵاوکراوەتەوە ساڵی ١٩٥٨ بەشێوازی بەشێك لە کتێبی"الصراط المستقيم"لە نوسینی کینث مۆرگان. پاشان شێخ (احمد فضلية) کردوویەتییە عەرەبی و لەگەڵ کتێبی "دراسات اسلامية في العلاقات الدولية و الاجتماعية"دا بڵاوی کردۆتەوە.

**١٦-  "اوراق محمد عبدالله دراز": ئەو نوسینانەیە کە دەراز لە کاتی گەنجییدا بڵاوی کردوونەوە ساڵانی ١٩١٩-١٩٢١ وەك شێخ (احمد فضلية) کۆکەرەوە و بڵاوکەرەوەی بۆی باس کردم. شێخ وتی لە چاپخانەیە و هیوادارم پێش وەفاتی (میهری خودای لەسەر) بڵاوکرابێتەوە.گرنگە ئاگاداریی بدەینە ئەو خوێنەرانەی شارەزا نین لە نوسینەکانی دەراز، کە گوشراوی هزری دەراز لە چوار کتێبیدایە، ئەوانیش:"دستور الاخلاق في القرآن الكريم" و "الدين" و "النبأ العظيم" و "مدخل الى القرآن الكريم". دەراز روح و هزری خۆی هەڵڕشتۆتە ناو ئەم نوسینانەیەوە، و کافییە بۆ خوێنەرێك کە زۆر پێویستی بە شارەزایی نەبێت لە دەراز. و نوسینەکانی تری دەراز نزیك و هاوشێوەی بیرۆکە گەورەکانی ناو ئەم چوار کتێبەن.**

**هەروەك ئەم کتێبانە-لەگەڵ "المختارات من كنوز السنة و "الميزان بين السنة و البدعة"- دەراز خۆی ناونیشانی بۆ داناون. نوسینەکانیتری بریتین لە کۆکراوەی بابەت و وانەکانی، و لەلایەن ئەو کەسانەی کۆیان کردوونەوە ناونیشانیان بۆ دانراوە.**

# بەشی دووەم

# ئاماژەکانی میانڕەوی لە هزری دەرازدا

خودای کردگار موحەممەدی پەیامبەر (درودی خودای لەسەر)ی نارد بە پەیامێکی پاکی لێبوردەوە کە بووە هۆی بەرزکردنەوەی پلەی مرۆڤ بۆ پلەی بەندایەتیی خودا بێ زۆرداریی، و ئازادکردنیان لە بەندایەتیی بەندە بێ ستەم لێکردنیان. میانڕەویی لەو چەمکانەیە کە ژاوەژاوێکی زۆر دەربارەی دروست بوو لەم دواییەدا، زۆرێك خۆیان پاڵدایە لای جا بە ڕاستگۆیی بێت یاخود تەنها بانگەشە، و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر قوڵیی ڕیشەی ئەم چەمکە و دەسەڵاتی لە کلتوریی ئێستامان دا، هەروەك-بە هەمان ڕێژەش- بەڵگەیە لەسەر ناڕونیی چەمکەکە لە هزر دا.

## پێناسی میانڕەوی

ئێمەش دەستپێکی ئەم بەشە دەکەین بە ناساندنی میانڕەویی ئیسلامیی، بۆ ئەوەی خوێنەر بەرچاو ڕون بێت دەربارەی مەبەستمان لە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە.

دەڵێین: میانڕەویی هەڵوێستێکی هزریی و کردارییە لە کۆکردنەوەی بەپیرۆز زانینی ڕاستیی و بەسۆزیی بەرامبەر بەدیهێنراو (المخلوق)، ئەمەش هەڵوێستێکی ئاوێتەیە و خاوەنەکەی پەی دەبات بە ڕێژەیی تێگەیشتنی مرۆڤ لە سروشی نێردراو (الوحی المنزل)، بۆیە ئاوەز و دەق کۆدەکاتەوە پێکەوە، و هەڵسوکەوت لەگەڵ هەمووان دەکات لەسەر بنەمای باشترینیان، و بە ویژدانیشەوە دەڕوانێتە ئەو کەسانەی لە بۆچوندا لەگەڵی جیاوازن.

دەتوانین چەمکی میانڕەوی دابەش بکەین بۆ دوو بەش: بەشێکی دوورکەوتنەوە، و بەشێکی لەخۆگرتن. میانڕەوی لە ناوەرۆکدا بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە تاکڕەوی و شلگیریی بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام و جێبەجێ کردنی، و وەرگرتنی لایەنی باشی هەمووان و دورکەوتنەوە لە لایەنی نەرێنییان. بۆیە کەسی میانڕەو هەمیشە لە نێوەندی قوتابخانە ئیسلامییەکاندا خۆی دەبینێتەوە، و بڕیار نادات لەسەر هیچ قوتابخانەیەکی دیکە بە ئەرێنی ڕەها یاخود نەرێنیی ڕەها.

باشترین کەسانێك من پەیم پێبردبن بۆ بەرجەستە کردنی چەمکی میانڕەوی ئیسلامی؛ لە کۆندا: (عبدالرحمن بن الجوزی)یە و لە هاوچەرخانیش: (شێخ یوسف القرضاوي)یە. (ابن الجوزی) باسی بیرۆکەی میانڕەوی دەکات لە لایەنی

دورکەوتنەوەوە، و بە شەش ئاگاداریی پوختەی لادانە مەنهەجییەکانی کەلەپوری ئیسلامیی دەخاتە ڕوو، و دەڵێت:"وریا بە لە چەقبەستوویی ئەوانەی دەقەکان دەگوازنەوە، و درێژبڕی ئەوانەی خۆیان بە زانستی کەلامەوە سەرقاڵ کردووە، و زیادە ڕەوی کردنی هەندێك بە ناوی خۆگرتنەوەوە، و چاوچویی ئەوانەی شوێن ئارەزوو کەوتون، و وەستانی زانایان لەسەر ڕووکاری زانست بێ کردار، پەرستشی بێ زانست".

شێخ (يوسف القرضاوي)یش لە بارەی لایەنی لەخۆگرتنی میانڕەوییەوە دەڵێت:"سود وەرگرتن لەوەی لە پاشخانە فراوانەکەماندایە بە هەموو جۆرەکانییەوە: لە توندوتۆڵی شەرعزانان، و بنەڕەت دانانی زانایانی اصول، و پاراستنی فەرمودەناسان، و برەودانی زانستی کەلام بە هزر و ئاوەز، و ڕۆحانییەتی سۆفییەکان، و گێڕانەوەی مێژووناسان، و ناسکی ئەدیبان، و ئەندێشەی هۆنەران، و بیرکردنەوەی داناکان، و ئەزمونی زانایان".

شێخ عبداللە دەراز پێشەوایەك بوو لە پێشەوایانی میانڕەویی ئیسلامیی لێبوردە، هەروەك خوێندنەوەی فراوانی ئەو هێڵەی کێشاویەتی، دەریدەخات. خاوەن ڕۆشنبیرییەکی زۆر و ئاسۆیەکی فراوان بوو، سودی وەردەگرت لە بیرۆکەی سەرجەم ئاین و ڕێبازەکان، و پاشان لە بێژنگە قورئانییەکەیی دەدا، و دەیکردە

گوڵاوێکی ئیسلامیی پوختە. دەراز باسی ڕۆشنبیرییە ئاوێتەکەی خۆی دەکات لە سەرەتای کتێبە بەناوبانگ و گرنگەکەی (دستور الاخلاق فی القران) و دەڵێت:"کارکردنمان لەم نوسینەدا بەجۆرێکە کە هزر و بیرۆکە ڕەوشتییە ڕۆژهەڵاتییەکان تیایدا دەگەن بە هاوشێوە ڕۆژاواییەکانیان، لە بەراورد کردنێکی هۆشیارانەی بێ لایەن ، و دوور لە هەموو بڕیارێکی پێشوەختە، و هەموو ئارەزوویەکی دەمارگیرانە بۆ قوتابخانەیەکی تایبەت، تاکە ڕێنماییکاری لە هەموو گفتوگۆکانیدا بریتییە لە ئاوەزێك کە ڕێنمایی وەردەگرێت لە گێڕانەوە توندوتۆڵەکان"

پاشان بەدوایدا پەیامێکی مرۆیی جوان ئاراستە دەکات و دەڵێت:"تۆ بڵێیت ئەم نزیك بونەوەیە لەنێوان کلتورە جیاوازەکان دا دەستپێك بێت بۆ بوارێکی کرداریی، و بەدوایدا تێگەیشتنێکی فراوانتر، و ئاوڕدانەوەیەکی زیاتر بەڕووی لایەنی مرۆیی، کە دڵەکان کۆبکاتەوە لێرە و لەوێ، و دەستەکان بخاتە ناو یەك بۆ چاکەی مرۆڤایەتیی؟!!"

قەبارەی ئەم نامەیە بواری زیاتر نادات بۆ زۆرتر لەسەر وەستان، بۆیە دیارترین ئاماژەکانی میانڕەوی لە هزری دەراز دا زۆر بە کورتی دەخەینە ڕوو، بە قسە کردن لەسەر پێنج دوانەیی کە لە ڕابردوو و ئێستادا هزری ئیسلامیی سەرقاڵ کردووە، ئەوانیش: ئاوەز و دەق، ئاین و زانست، جەبر و ئیختیار،

شوێنکەوتن و داهێنان-السنة و البدعة-، ئاشتی و جەنگ. بەڵام پێش قسە کردن لەسەر ئەو دوانەییانە، چەند ئاماژەیەکی خێرا دەکەین بۆ قوڵیی پەیبردنی دەراز لە پەیامی ئیسلامیی و سروشتی لێبوردەی.

## پلەبەندی و پەرەسەندن

دەراز پەیبرد بەوەی یەکێك لە خەسڵەتەکانی پەیامی ئیسلامیی پلەبەندی و پەرەسەندنە، و هەر یەك لەم دوو خەسڵەتەش دیاردەیەکن لە دیاردەکانی میانڕەوی. بۆیە ئاماژە دەکات بەوەی کە مەنهەجی دانایانەی پلەبەندی لە گۆڕینی دەرونەکان دەربڕی ڕەسەنایەتیی ئەم پەیامە و دانایی خودایە، بەڵکو تەنها بە بیرۆکەی پلەبەندییەوە ناوەستێت، بەڵکو تێیدەپەڕێنێت بۆ پەرەسەندن بەرەو کامڵ بوونی یاسایی و ڕەوشتیی لە ڕۆژی:"إقرأ بآسم ربك الذي خلق" (العلق: ١) تا ڕۆژی :"اليوم اكملت لكم دينكم" (المائدة: ٣)

دەراز نمونە بەناوبانگەکەی حەرام کردنی "الخمر"ی لە قورئاندا هێنایەوە، کە قورئان دەستپێدەکات بە ختوکەدانی ویژدانی مرۆڤ لە ئاماژەیەکی سەرپێیی دا بۆ "السَکَر" کە

"الخمر"ی خستۆتە دەرەوەی بازنەی ڕۆزی چاك و پاك[1]، پاشان قورئان هەنگاوێکیتری ناوە بۆ باسکردنی "الخمر" بە هەڵە، بێ ئەوەی باسی حەرام کردن بکات، پاشان حەرامی کرد بەشێوەیەکی کاتیی تەنها لە کاتی نوێژەکاندا، و لە کۆتاییدا حەرامی تەواو و هەمیشەیی کرد. لەنێوان هەر هەنگاوێك و هەنگاوەکەی دواتریدا، هێندە کات هەبوو بۆ پەیبردنی خەڵکی بە واتای ڕەوشتیی دەقەکە و وێنا کردنی لە دەرونیاندا. ئایەتەکانی دەربارەی "الخمر" هاتوون، چوارن"چوارەمیان و کۆتاییان ئەوە بوو کە ئاماژەی کرد بۆ حەرامی خواردنەوەی بێهۆشکەرەکان. هەرچی سێ ئایەتەکەی سەرەتان ئەوا چەند قۆناغێکی پلەبەندین بۆ ئامادە کردنی دەرونی باوەڕداران بۆ وەرگرتنی ئەم حەرام کردنە".

وەك ئەوەی قورئان پێمان بفەرمویێت کە چارەسەر کردن بە پەروەردەی ویژدان باشتر و کاریگەرترە لە چارەسەر بە هێزی یاسا بە ڕێژەی لە سەدا حەفتا و پێنج ٧٥٪، و ئەمەش کاتێك سێ ئایەتی تایبەت کرد بە دواندنی ویژدان، و تەنها ئایەتێکی کردە دەقێکی یاسایی یەکلاکەرەوە.

---

[1] وەك ئاماژەیەك بۆ فەرمایشتی خودا کە دەفەرمویێت:"و من ثمرات النخیل و الاعناب تتخذون منه سکرا و رزقا حسنا"(النحل: ٦٧)

دەراز دەربارەی ئەم پلەبەندییە دانایییە و نەرمونیانییە پڕ سۆزە، بۆ هەڵکەندن و لەناوبردنی الخمر دەڵێت:"ئەم ڕێبازە ئاسانە پلەبەندییە دەخوازێت لێمان کە شێوازی دکتۆری کارامە وە بیر خۆمان بێنینەوە بۆ چارەسەری نەخۆشیی درێژخایەن، بەڵکو مەنهەجی دایکان لەبەرچاو بگرین کاتێك دەیانەوێت کۆرپەکانیان لە شیر ببڕنەوە...ئای چەندێك میهری خودا زۆر و گەورەیە بۆ بەندەکانی بە جۆرێك نە هونەری چارەسەر کردن گەیشتووە پێی و نە سۆزی دایکانیش".

دەراز لە سنوری تەشریعاتە لاوەکییەکان دا، کە پلەبەندی تیایاندا دەردەکەوێت وەك حەرام کردنی الخمر و سووخواردن، نەوەستاوە، بەڵکو بەشێوازێکی قوڵتر و فراوانتر ڕوانیویەتییە بابەتەکە، و ڕوونی دەکاتەوە کە:"قۆناغی مەککیی بە گشتی، جۆرێك بوو لە ئامادەکردن، بەڵام پیادەکردن و دیاریی کردنی ئەم پرنسیپە گشتییانە دابەش کران بەسەر دە ساڵ دا. هەروەها دەتوانین بڵێین هەر بابەتێکی نوێ لە بواری تەکلیف دا، پێشکەوتنێك و چوونە پێشەوەیەکی لەخۆ دەگرت بەراورد بە قۆناغی پێشووی، و خاڵی دەستپێك بوو بۆ بابەتی دوای خۆی". قۆناغی ئامادەکردنی گیانیی و دەرونیی، لە مەککە، وەرچەرخا بۆ پلەبەندی تەشریعی و ڕەوشتیی، لە مەدینە، هەردوو قۆناغەکەش دەرخەری پەرەسەندنی پەیامەکەیە بەرەو تەواویی و کەماڵ

بەگوێرەی تێگەیشتنی وەرگرەکانی و گەشەکردنی بەردەوامیان بەرەو تەواوییەکان.

هەروەها دەراز پەی برد بەوەی ئاسانکاریی-کە یەکێکە لە دیاردەکانی میانڕەوی لێبوردە-لە تایبەتمەندترینی تایبەتمەندییەکانی ئیسلامە، و لە بابەتە زۆر و زەوەندەکانی ڕێگەپێدانەکان (الرخص)دا دەردەکەوێت لە باری نائاساییدا، وەك کورت کردنەوەی نوێژ و دواخستنی ڕۆژوو لە کاتی نەخۆشی و سەفەر،"لەم بارەدا بەتایبەتی، سروشتی میهرەبانیی یاسای قورئانیی دەردەکەوێت...لە گۆڕینی پێویست-الواجب- بەپێی بارودۆخی نوێی ژیان... ئەمەش بەپێی خواستی بارودۆخەکە دەبێت، جا گۆڕین بێت، یاخود کەمکردنەوە، یاخود دواخستن، یاخود سڕینەوە و لابردن". دەراز تێبینی ئەوەشی کرد-هەروەك لە بابەتی پلەبەندی دا سەرنجی پێدا- ئاسانکاریی کورت هەڵنایەت لەسەر بابەتی تەشریعیی بە تەنها، لە وێنەی ئەوانەی ئاماژەمان بۆ کردن، بەڵکو ئاسانکاریی بەناو جەستەی تەشریعی ئیسلامیدا ڕۆچووە، و "بابەتەکە تەنها سەبارەت بە چەند بارێکی نائاسایی نیە، یاخود سەبارەت بە ڕوداوێکی تازە پەیدا بوو بەرێکەوت، بەڵکو پرنسیپێکی گرنگە، و جێبەجێ کردنی ئامانجێکە دەبێت هەمیشە ڕەچاو بکرێت".

## تەواوکاریی و هاوسەنگی

یەکێکیتر لە دیاردەکانی میانڕەوی لە شەریعەتی ئیسلام-وەك دەراز تێبینی کردووە-ڕێگری کردنە لە تێپەڕاندن چونکە بێگومان سەر دەکێشێت بۆ بەزایەدان. ئەمەش لە ڕێگرییەکانی پێغەمبەری خودادا دەردەکەوێت لە هەموو ئارەزوویەك بەرەو گۆشەگیریی-بەناوی پەرستنەوە{وەرگێڕ}- و دنیا بەکەم گرتنی لە سنور بەدەر لەبەر ئەوەی هۆکارن بۆ "لادانێکی دژ بە کرۆك و جەوهەری شەریعەت" چونکە "هەر کردارێکی پەرستن دەبێت ئەوەندە کات بخایەنێت کە دڵ تیایدا هەست کردن بە چالاکی و خۆشیەکەی بمێنێت، چوون پێویستە لەسەرمان کە پەرستنی خودا وا لێنەکەین دڵمان لێی بێزار ببێت"

شەرعی خودا دەیەوێت پەرستن کارێکی بەردەوام بێت کە وا بکات ویژدان بێدار و لە زیندوێتی بەردەوام دا بێت. پێشەوا بوخاری بەشێکی تایبەت کردووە لە کتێبی فەرمودە ڕاستەکانی لە ژێر ناونیشانی: (بەشی مەبەست و بەردەوامیی لە کارکردن) هەروەك پێشەوا موسلیم بەشێکی تایبەت کردووە بە (گەورەیی کاری بەردەوام)، و هەردوکیان چەند فەرمودەیەکیان هێناوە کە بە ئاشکرا داخوازی ئەو بابەتە دەکەن، یەکێك لە فەرمودەکان ئەوەیە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) دەفەرموێت:"سددوا و قاربوا، و اعلموا ان لن يدخل احدكم عمله الجنة، و إن احب

**الاعمال الی الله ادومها و إن قل"، واتە: هەوڵ بدەن نزیك ببنەوە- لە مەبەستەکانی خودا لە داواکردنی پەرستنەکان (وەگێڕ)-، و بزانن کەس ناچێتە بەهەشت تەنها بە کردەوەی خۆی، و باشترین کردارەکان لای خودا ئەوەیە کە بەردەوامیی هەبێت، ئەگەر چی کەمیش بێت.[١]**

**بۆیە هەر تێپەڕاندن و گڕوتینێك، بەزایەدان و ساردوسڕی بەدوای خۆیدا دەهێنێت، جا ئەوەی "هەڵە دەکات بەوەی زۆر کردارێك ئەنجام دەدات، زۆرجار کۆتاییەکەی دەبێتە سارد بونەوە لە هەمان کردار، بەڵکو هەندێك جار هەر پشتی تێدەکات".**

**بەم چەشنە لە چوارچێوەی تێگەیشتنە قوڵەکەی لە باشی و خەسڵەتەکانی شەریعەت، دەراز گەیشتە ئەوەی کە "شەریعەتێکی گشتی و هەمیشەییە، داخوازییە ڕەواکانی مرۆڤایەتی دابین دەکات، بەڵام زۆر بە ڕاشکاوی و جەخت کردنەوەوە دژی ئارەزووە بێسنورەکانی دەوەستێت". پاشان دەراز ڕوو دەکاتە چارەسەر کردنی دوانەییە قورسەکانی هزری موسوڵمانیان ماندوو کردووە**

---

[١] **لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆ پێشەوا بوخاری و موسلیم و نوسەری کتێبەکەش کە فەرمودەکەی هێناوە، بەڵام پێم وایە ئەو بەشەی فەرمودەکە کە بریتییە لە(و اعلموا ان لن یدخل احدکم عملە الجنة) پێچەوانەی چەندین دەقی ڕاشکاوی قورئانە، لەوانەش(و ان لیس للانسان الا ما سعی) بۆیە پێم وا نیە ئەوە فەرمودە بێت و پێغەمبەری خودا شتی لەو جۆرە بفەرمویت-وەرگێڕ-**

به چارەسەرێکی مەنهەجییانە، لەژێر ڕوناکی ئەم تێگەیشتنە قوڵەی لە تایبەتمەندییەکانی شەریعەت وەك پلەبەندی و پەرەسەندن و تەواوکاریی و هاوسەنگی و ئاسانکاریی و دورکەوتنەوە لە بێزارکردن...و لە هەر یەك لەم پێنج دوانەییانە تێگەیشتنێکی داهێنەرانە دەخاتەڕوو، و ئێمەش بە کورتی باسیان دەکەین.

## ئاوەز و دەق

یەکەم دوانەیەك کە هزری ئیسلامی دەهەژێنێت لە سەرەتای دروست بونیەوە، و تا ئێستاش دەرگای قسە لێکردنی کراوەیە، بریتییە لە پەیوەندی نێوان ئاوەز و دەق، و شێوازی گونجاو بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوانیان. ژاوەژاو و قسەی بێبنەما زۆر بوو لەسەر قسە کردن دەربارەی ئەم دوانەیە، جا لەناو موسوڵمانان کەسانێك دەرکەوتن کە دژایەتی ئاشکرای ئاوەزیان دەکرد، تا وای لێهات"عەقڵانیەت" بووە ناووناتۆرە بۆ ناشیرین کردن لە عورفی سەلەفییەکانی هاوچەرخ، و بە ویستی خۆیان دەستیان هەڵگرت لە ئاوەزی خۆیان، وەك ئەوەی پرسیارەکەی (عمر بن الوردی)ی هۆنەریان بیرچۆتەوە: "چۆن هەوڵی شێتی دەدات، کەسی خاوەن ئاوەز؟" هەروەك کەسانێکیش تێیانپەڕاند لە ڕۆڵی ئاوەز و و

متمانەی زیاد لە سنور بە هزری مرۆڤ، وەك ئەوەی ئەمانیش سنوری هزری مرۆڤ نەزانن بە بەراورد بە زانستی ڕەهای خودا.

ئەم بێبنەماییە لە قسە کردن لە ڕۆشنبیریی هاوچەرخ دا، درێژکراوەی قسەکردنی بێبنەمای کۆنە، کە موعتەزیلە بانەگەشەیان دەکرد لە بوونی"سیستمێکی هزریی ساغ، پێی وایە تەنها بە ڕوناکی ئاوەز دەتوانێت بگات بە باوەڕ هێنان بە خودای تاك و تەنها، و ئەو ڕێسا ڕەوشتییانەی کۆنترۆڵی کردارەکانی دەکەن، هەروەك دەتوانین بگەینە ئەو ڕێسایانەی پێویستن لەسەرمان". ڕێبازی موعتەزیلە ئەنجامێکی مەترسیداریی لەخۆ دەگرت، ئەویش دەست هەلگرتنێکی تیۆریانەیە لە پەیامە ئاسمانییەکان، و تەنها پشت بەستن بە ڕوناکی سروشت-الفطرة-ی ناو دەرون و وازهێنان لە ڕوناکی سروش-الوحی-ی ئاشکرا. ئەوان پێیان وایە کە"گریمان خودا ویستی خۆی دەرنەخستایە لە پەرتوکە ئاسمانییەکان، و فەرمانەکانی نەناردایە بۆ پەیامبەرانی، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەمانتوانی بیزانین، و پاشان لەسەرمان بوو کە شوێنیان بکەوین، پەرتوکەکان و پەیامبەران کارێکیان نەبوو جگە لە سەلماندنی بۆچونە هزرییەکانمان و ڕون کردنەوەیان".

زۆرینەی زانایانی ئیسلام دژی ئەم بۆچونە وەستاونەوە، و جەختیان کردۆتەوە لەسەر ئەوەی"بۆ پێویست بوونی بەرپرسیارێتیمان بەرامبەر خودا، دەبێت شەریعەتێك لای ئەوەوە

بێت بۆمان به شێوازێکی ئەرێنی و ڕاشکاو، له بەرامبەر ئەو یاسایەی له ناخماندا دایناوه وەك سروشتێکی خوارسك"، بەڵام هەندێك لەوانەی ویستیان وەڵامی ئەم تێپەڕاندنەی موعتەزیله و سەرکەشییه هزرییەکەیان بدەنەوه، و توانای هزری و شەرعیی پێویستیان نەبوو، خۆیشیان کەوتنەوه بانگەشەی بێبنەما، هەروەك دەراز تێبینی کرد. بەم شێوەیه"بۆ بەرەنگار بونەوەی ئەم لەخۆبایی بونه بێبنەمایه، و متمانه هەڵئاوساوه به ئاوەزی مرۆڤ، ئەشعەرییەکان کەوتنه وەڵام دانەوەی ئەم بیرۆکەیه به بیرۆکەیتر، بەجۆرێك گیانی چەلەحانێ زاڵ بو بەسەریاندا که زیادەڕەوییەکی دژیان هێنایه بوون" و له بەشی "الجبر و الاختیار" دا، چەند وێنەیەك له لاوازی تیۆریی دەبینین لای ئەشعەرییەکان لەم بوارەدا.

بەڵام باشترین هزرەکانی سەدەی بیستەم[1] پەییان برد بەوەی شەرع و ئاوەز دوو سەرچاوەی یەکتر تەواوکەرن له سەرچاوەکانی ڕوناکی خودایی، ڕێگەمان بۆ ڕوناك دەکەنەوه بەرەو ڕاستیی و چاکه و جوانیی، و واتا و مەبەستیش دەدەنه ژیانمان. دانانی هەرکامیان وەك دژ بۆ ئەویتر لاسەنگی دروست دەکات له

---

[1] ئاماژەیه بۆ کتێبێکی نوسەر خۆی له ژێر ناونیشانی (خيرة العقول المسلمة في القرن العشرين) و سوپاس بۆ خودا وەرمانگێڕاوەته سەر زمانی کوردی و ناوەندی خاڵ چاپیان کردووه-وەرگێڕ-

بیرکردنەوە و پەرت بوونیش لای تاکی باوەڕدار. توانای هزریی بۆ جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست بەشێکە لەو سروشتە خوارسکەی خودا مرۆڤەکانی لەسەر بەدیهێناوە، پاشان پێغەمبەران هاتن بۆ دوپات کردنەوەی ئەم سەروشتە و پاککردنەوەشی لە خلتەی گومانی بەلارێدابەر و ئارەزووی خەڵەتێنەر.

لەگەڵ ئەوەشدا، چەند جیاوازییەکی جەوهەریی هەیە لەنێوان ئاوەزی تەنها و بێبەش لە سروش، و ئاوەزی ڕێنمونی کراو بە سروش، و دەراز پوختی کردونەوەتەوە لە سیاندا: جیاوازی یەکەم ئەوەیە کە ئەو ئاوەزەی ڕوناکی سروش ڕێنمایی نەکردووە، دەمانگەیەنێتە زانیارییەکی ساردوسڕ، بێ ئەوەی پابەندمان بکات بە شوێنکەوتنی، لەکاتێکدا سروش ڕاستییانێکی زیندوومان پێشکەش دەکات وەك زیندوێتی مرۆڤ، پێکاهتوو لە گۆشت و خوێن، و پابەندمان دەکات بە پابەندکردنێکی خۆشویستنانە و گوێڕایەڵیی کردنی دەرهاویشتەکانیشی. ئەوە جیاوازی نێوان ئاین و فەلسەفەیە هەروەك دەراز تێبینی کردووە:"ئامانجی فەلسەفە بریتییە لە زانیاریی، و ئامانجی ئاینیش بریتییە لە باوەڕ. داخوازی فەلسەفە بریتییە لە بیرۆکەیەکی وشك لە شێوازێکی ڕاوەستاودا، و داخوازی ئاین گیانێکی تێکۆشەر و هێزێکی بزوێنەرە" چونکە سروش تەنها

ڕاستیی دەرناخات لە چوارچێوەیەکی تێوریيدا، بەڵکو دەیکاتە "بیرۆکەیەکی زیندووی هەست بزوێنەر"

جیاوازیی دووەم بریتییە لە تایبەتمەندیی سروشتی ڕاستیی، لای ئاین و لای فەلسەفە، و شوێنەواری گەورەی ئەم جیاوازییە. لەبەرئەوەی کە "سروشتی بیروباوەڕ بەخشندەیەکی نەبڕاوەیە، و بەردەوام حەزی بە بڵاو بوونەوە و بەشداریی پێکردنە، و خاوەنەکەی هاندەدات بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی بە سەرکەوتن و بانگەواز. لە کاتێکدا بیرۆکەی زانستی یاخود فەلسەفی حەزی-وەك هەر سەرمایەیەکی مرۆیی- بە دەست بەسەردا گرتن و قۆرخکارییە".

جیاوازی سێیەمیشیان بریتییە لەوەی ڕاستییە هزرییەکان"سنوردارن بە هەموو سنورەکانی سروشتی مرۆڤ، و پلەبەندی هێواش بۆ گەیشتن بە نەزانراوەکان". لەکاتێکدا ڕاستییەکانی سروش"بەدیهێنراوێکی خوداییە...{و} بەخششێکی بەخشندەیە بۆ هەڵگران و باڵیۆزانی{کە پێغەمبەرانن} بێ هەوڵدان و ماندوو بوونی خۆیان، و بە ڕوناکییەکەی دایاندەپۆشێت لە چرکەساتێکی هێندەی چاوتروکانێك یاخود کەمتریش لەوە".

لەگەڵ ئەمەشدا، ئیسلام داوا لە مرۆڤ ناکات باوەڕ بە شتانێك بهێنێت کە ئاوەزی بە ئاگا وەریناگرێت، و لۆژیك بڕیار دەدات لە

بێنرخییان، له وێنەی هەندێك له بیروباوەڕی دیانەكان وەك ئەوەی تارتولیان (١٥٠- ٢٤٠ زاینی) یەكێك له پێشەوایانی كەنیسە، كه دەڵێت"باوەڕی پێدەكەم چونكه ئەستەمە"!! بەڵكو ئیسلام ئاینی خوارسكی بونیادنراوە لەسەر لۆژیك و بەڵگەی پەسەندكراو لای ئاوەزی مرۆڤان، وەك: یاسای هۆكاریی (قانون السببیه) و ڕەدكردنەوەی دژیەكی...هتد بۆیه له ئیسلامدا دژایەتی نیه لەنێوان هزر و دەق تەنها لای ئەوانه نەبێت كه ئاوەزیان ناتەواوه یاخود دەقەكانیان لاوازە.

(ابن تیمیه) ڕەوانبێژانه دەربارەی ئەمه دەدوێت و دەڵێت:"هەموو گومڕاییەك پێچەوانەی ئاوەزە، هەروەك چۆن پێچەوانەی شەرعە"، و دەڵێت:"هەر ڕێگەیەك سەربكێشێت بۆ پێچەوانەی ڕێبازی پێغەمبەر ئەوا پوچه لای ئاوەز، هەروەك پێچەوانەیشە لەگەڵ شەرع". هۆكاری ئەم هاوتەریب بوونه پتەوەی نێوان ئاوەز و دەق له شیكاریی (ابن تیمیه)دا بریتییە لەوەی"خودا بەندەكانی لەسەر ڕاستی بەدیهێناوە، و پێغەمبەرانیش نێردراون تا ئەو سروشتە خوارسكه تەواو بكەن و بەهەندی وەربگرن، نەك دەستكاریی بكەن و بیگۆڕن. بەڵام دوژمنانی پێغەمبەران دەیانەوێت سروشتە خوارسكەكە بگۆڕن"، و "پێغەمبەران نێردراون بە تەواوكاریی سروشتە خوارسكەكەوە،

نەك بە گۆڕینییەوە"هەروەك (ابن تیمیە) بە قولیی پەی پێبردوە و پێداگیریی کردوە لەسەری، لە زیاتر لە کتێبێکیدا.

دەرازیش هەولیداوە بۆ ئاشکرا کردنی بەخششی ئاوەز و گرنگی دان پێی، لەگەڵ دانان بە سنورە سروشتییەکانی دا، بۆیە دەڵێت:"گومانی تێدا نیە کە ویستی ئاوەزدار بە بەهاترین بەشی ناخی مرۆڤە، و پێی دەناسرێینەوە، بەجۆرێك کە بەشەکانیتری {پێکهاتەمان} هاوبەشە لەگەڵ بونەوەرەکانیتر. ئەو بەشەیە کە دەتوانێت کۆمان بکاتەوە لەگەڵ خۆمان، لەکاتێکدا هەستەوەرەکان پەرت و بڵاومان دەکەنەوە لە دەرەوەی خۆمان. بۆیە ئەوەیە کە خودا مافی ڕابەرایەتیی پێببەخشێت، و هەروەها ڕۆڵی پرنسیپی ڕێکخەر"

هەروەها دەراز ڕونی دەکاتەوە-وەك (ابن تیمیە) پێشتر ڕونی کردەوە- کە پەیوەندییەکی پتەو هەیە لەنێوان ئاوەز و سروش، بۆیە دەڵێت:"لە قورئان دا ئاوەز و دەق پێکەوە گوزەر دەکەن، شان بە شانی یەك، ئەمەیە لە فەرمایشتی خودا دەفامرێت﴿و قالوا لو کنا نسمع او نعقل ما کنا في اصحاب السعیر﴾. لە دڵی باوەڕداردا دوو ڕوناکی جێگیر دەبێت، لەکاتێکدا بێباوەڕ تەنها یەك ڕوناکی هەیە، و ئەوەش نهێنی کۆدی جوتە ڕوناکییە لە فەرمایشتی خودادا :﴿نور علی نور﴾".

چونكە شەریعەتی سروشتی خوارِسك پشتئەستور دەبێت بە شەریعەتی سروشی ڕەوشتدار،"ڕۆڵی ئەم شەریعەتە نوێیە-بێ گومان- ئەوە نیە كە یاسای سروشتی خوارِسك پوچەڵ بكاتەوە، چونكە ئەوانە دوو ڕاستین، بە هیچ جۆرێك نابێت دژیەك بن، بەڵكو ڕۆڵی شەریعەتی خوداییە كە یاسای سروشتی خوارِسك جێگیر بكات، و پشتگیرییەكی پتەوی بداتێ، ئەمەش لە كاتێكدا كە دەیدۆزێتەوە بە تەواوی پاكیی و جوانییەوە".

دەراز زیاتری دەكات، بەجۆرێك كە پێی وا نیە هەر لە بنەڕەتدا ئەمانە دوو سەرچاوەی جودا بن، بەڵكو سورشتی خوارِسك و سروشی تەواوكار و دوپاتكاری بریتین لە دوو ئاستی هەمان سەرچاوە، بەڵام ئەم دوو سەرچاوەیە جودان لە ئاستی پاكییان و نزیكییان، لەبەرئەوەی "نزیكترینیان لە خەڵكی ﴿كە ئاوەزە﴾ پاكییەكەی كەمترە، و ئەو ڕوناكییە تەواوكارەی ﴿ئاوەز كە سروشە﴾ ئاسان نیە گەیشتن پێی".

دەراز هیچ بەهانەیەك نابینێت بۆ كەمكردنەوەی ڕۆڵ و ئاستی ئاوەز. چوون ئاوەز جێكەوتەی بنەڕەتیی تەكلیفی خودایە، و هەر ئەویش ئەو وەرگرەیە كە قبولْ دەكات یاخود ڕەد دەكاتەوە، و پاشان ئەم ویستە دەسەپێنێت بەسەر هەموو قەوارەی مرۆڤ دا. هەرچی ڕوناكی سروشە، ئەوا سەرچاوەیەكی دوپاتكەرەوەی ڕوناكی ئاوەزە، "هیچ دەسەڵاتێكی﴿مەبەستی

مادییه﴾ نیه بەسەرمان دا، و هیچ واتایەکی ڕەوشتیی نیە مەگەر ئەوەی ویژدانی تاکە کەسیمان پێیدەدا، بەو مەرجەی کە دانیپێدابنێت ﴿مەبەستی ویژدانەکەیە﴾، چوون هەموو فەرمانێکی ڕاستەوخۆمان لەم ویژدانی تاکە کەسییەوە وەردەگرین، و هزری مرۆییمان فەرمانمان پێدەکات کە گوێڕایەڵی هزری خودایی ببین". بۆیە قورئان ڕێنماییەکانیمان بەداڕشتنی هزرییانە پێشکەش دەکات، و لە ڕێی گوتاری هزرییەوە، و "جەخت دەکاتەوە لەسەر هاوتەریب بوونی لەگەڵ ئاوەز، و دانایی، و ڕاستیی، و دادگەریی، و بەردەوامیی لەسەر ڕاستەڕێ، هاوشان لەگەڵ بەهاکانی دی، ویژدانی ڕەوشتی تاکیان لێ پێك دێت" لە بنەڕەتی پێکهاتەی دا.

ڕاستیی هەرگیز دژ نابێت لەگەڵ ڕاستیی دا، و مەحاڵە دژیەکیی لەنێوان ڕاستییەکانی سروش و ڕاستییەکانی ئاوەز. بەڵکو ئاوەز بنەمای ئاینە و جیکەوتەی تەکلیفی خودایە. ئاین دادەمەزرێت لەسەر پرنسیپەکانی لۆژیك و دەستپێکیشیان ئاوەزە کە هەموو ژیرەکان پێی قایلن. دەراز ڕوونی دەکاتەوە کە"دیاردەی ئاینداریی لە بنەڕەتدا لەسەر دوو پرنسیپی هزریی دادەمەزرێت، ئەوانیش یاسای هۆکاریی و یاسای ئامانج و مەبەستی کۆتاییە" و دەڵێت"ئەگەر بە تەواوی لەم دوو یاسایە تێبگەین ئەوا دەگەینە بەرزترینی بیروباوەڕە ئاینییەکان:

بیروباوەڕی یەکخواپەرستی، و نەمریی گیان (روح)، و بیروباوەڕی هاوتادانان بۆ خودا و لەناوچوون ﴿بێباوەڕی﴾ بریتییە لە نەوەی بێئاگایی و تەمەڵیی هزریی".

هەرچی یاسای هۆکارییە، ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هیچ شتێك لەوانەی (ممکنات)[1]ن، ناتوانن خۆیان بەدیبهێنن بێ هۆکارێك، ئەمە یاسایەکی هزریی گشتگیرە کە هەردوو جیهانی نەبینراو و بینراو پێکەوە گرێدەدات، "ئەوەی هۆکاری نەبێت لە جیهانی بینراو ئەوا دەبێت هۆکارێکی هەبێت لە جیهانی نەبینراو". جا ئەگەر ئەم یاسا هزرییە وەرگرین کە کەموکورتی تێدا نیە"ئەوا هیچ دەرچەیەکمان نیە جگە لەوەی بگەینە هۆکاری پێویست بۆ بوون، کە هۆکاری سەرجەم هۆکارەکانە".

هەرچی یاسای ئامانج و مەبەستی کۆتاییشە "ئەوا پێمان دەڵێت ناکرێت و ناگونجێت هیچ سیستمێکی ئاوێتەی گونجاوی

---

[1] لە فەلسەفەدا جیهان دابەش دەبێت بۆ ٣ جۆر:

١- واجب الوجود: واتە ئەوەی کە پێویستە هەبێت و بێ ئەو بوون نابێت و پێویستی بە بەدیهێنەر نیە و خۆی بەدیهێنەری جگە لە خۆیەتی کە ئەمە تەنها وەسفی خودایە.

٢- ممکن الوجود: ئەوانە دەگرێتەوە کە جگە لە خودان و دەکرێت هەبن وەك سەرجەم بەدیهێنراوەکان کە مرۆڤ یەکێکیانە

٣- ممتنع الوجود: ئەوەی کە ناکرێت هەبێت، وێنەی بوون و نەبوون(وجود و عدم)ی تەنێك لە هەمان کاتدا

سەقامگیر بێ مەبەست دروست ببێت و بەدیبێت، و دەبێت هەموو مەبەستێك ئامانجێکی هەبێت...تا دەگەینە ئامانجێکی گشتی جێگیر کە ئامانجی هەموو ئامانجەکانە". بەم جۆرە لۆژیکی سەرەتای ئاوەز ڕێنمونیمان دەکات بۆ بوونی بەدیهێنەری یەکەم و کۆتا کە هۆکاری هۆکاران و ئامانجی ئامانجانە. و ئاشکرا دەبێت "بوونی ئەم ڕاستییە لە سەرەتا و کۆتاییدا پێویستییەکی هزرییە ناتوانین تەسلیمی نەبین".

ئەگەر کەسانێك گومانیان برد بە ئاینی ڕاستەقینە بەناوی تێڕامانی هزرییەوە، ئەوە هۆکارەکەی کورت بینی و تەمەڵیی هزرییانە، یاخود لەبەر ئەوەیە: ئەو ئاینەی ئاشنا بوون پێی دەستکردی مرۆڤ، یاخود ئاینێکی ئاسمانی شێوێنراوە. لەبەر ئەوەی ئاینی ڕاستەقینە دژایەتی تیا نیە لەگەڵ بەرهەمەکانی هزری بێ لایەن، "چوون قورئان بڕیاری داوە لە شوێنەوارەکانی میهریی خودایی ئەوەیە کە تەنها بەڵگەی هزریی باس نەکردووە، بەڵکو پشتئەستوریی کردوون بە بەڵگەی دەقیش، و بیانوی هەر کەسێکی بێ ئاگا یاخود تەمەڵیشی بڕیوە".

دەراز هزرەکانی کردووە بە دوو بەشەوە لە ڕووی فراوانی ئاسۆ و تێروانینیان سەبارەت بە جیهانی نەبینراو: هزرە بە قەناعەتە پەلەکارەکان، هزری بەئاگای کراوە. هەرچی"هزری پەلەکاری بەقەناعەتە، ئەوا لەگەڵ نزمترین ئاستی پرنسیپەکانی

جیهانی نەبینراو و نزیکترین مەبەستەکانی دەوەستێت، بەوەندە دەوەستێت لە هەر بەشێك لە دیاردە گەردونییە هاوشێوەکان کە لە پشتییانەوە پرنسیپێکی پاڵنەر و ڕێکخەر هەیە، و لەبەردەمیشیانەوە ڕووگەیەکی دیاریکراو هەیە بەرەو ڕووی دەچێت، کەمتر وایە بگەڕێتەوە بۆ پرسیار کردن...سەبارەت بە سەرەتای بونەوەر بە گشتی، یاخود ڕووگەی گشتگیریان".

هەرچی هزری بەئاگای کراوەی بەرزیشە، ئەوا"قایل نابێت بە پێوەرە ڕێژەییەکان و ڕاڤە کردنی بەشیی (جزئی)، و قایل نابێت بە یاسای تاك تا دەگاتە یاسای یاساکان، بەڵکو هەوڵ دەدات بگاتە ئەو دەسەڵاتەی یاساکانی کۆکردونەوە و ڕێکیخستون...بە کورتی، هزرە بەرزەکان هەمیشە هەوڵ دەدەن لە پشتی ڕاستییە بەشییەکانەوە بگەنە ڕاستیی گشتیی هەمیشەیی" کە خودای دانایە پاك و بێگەردی بۆ وی.

پوختەی ئەوەی دەراز لە دوانەیی ئاوەز و دەق پێی گەیشتووە پێمان دەڵێت"جیاکاریی لەنێوان چاکە و خراپە... هەستێکی جێگیرە لەناو دەرونی مرۆڤ پێش ئەوەی یاسایەکی ئاسمانی بێت، و چاکە-لە کۆتاییدا- بەهای خۆی لە سروشتی خۆیەوە وەردەگرێت. و ئاوەز و سروش-بەم پێیە- ڕوناکییەکی ڕێنماییکاری دوانەن بۆ یەك بابەت، و وەرگێڕانێکی دوانەیین بۆ هەمان داکەوتی ڕەسەن، کە ڕەگی داکوتاوە لە قوڵایی شتەکان" لە

کاتێکدا یاسای خودا "تەواوکاری یاسای ڕەوشتیی سروشتیی خوارسکی ناخی مرۆڤە" و تەواوکارییەکەش زیادە یاخود لاوەکی نیە، بەڵکو پێویستییەکی گرنگی سروشتی مرۆڤە کە جار جار خلّتەی لادەر لەڕێی ڕاستیی و چاکەی، تێکەڵ دەبێت، یاخود تاریکییەکی سەرکێش بەرەو گومان و دڵەڕاوکێ. دەراز لێرەدا نمونەی دروشمە خواپەرستییەکان دێنێتەوە،"ئەگەر ڕێکخستنی ئەم پەرستشانە بدرێنە دەستی هەر کەسێك بۆ خۆی ئەوا لە دوو ئەگەر بەدەر نیە: یان بە دودڵی دەمایەوە و هیچی نەدەکرد، یاخود پەنای دەبردە بەر هەموو جۆرکانی ئەندێشە و زۆر لەخۆ کردن".

لەبەر ئەوە پێویستە لەگەڵ دەراز بڵێین کە"ئەو ڕوناکییە خوارسکەی ئارەزوو دایدەپۆشێت و خوو تێکیدەدات دەبێت جۆرێك لە جلّەوی بۆ دابنرێت، لەلگەڵ کۆمەڵێك ڕێنماییش، کە بە گوێرەی کات و شوێن و میزاجەکان دەگۆڕێن، ئەگەر نا، ئەوا دڵنیایی ڕەوشتیی-بە چاوپۆشی لە هەندێك واجباتی بنەڕەتی کە هەموو ویژدانە ئاساییەکان کۆکن لەسەری- شوێنەکەی چۆڵ دەکات وردە وردە بۆ بێئاگایی و گومان و گومڕایی".

بەبێ ڕوناکی سروشی دابەزیو لە ئاسمانەوە، ئەوا مرۆڤەکان لە ململانێی بەردەوام دا دەبن بۆ ناساندنی چاکە و خراپە"و هزر بە هزر بەرەنگاری دەکرێت، و سۆزیش بە سۆز". مێژووی

مرۆڤایەتییش کۆمەکیمان دەکات بۆ چەند وێنەیەك لەو تێکەڵ بوونە بێ سنورە، لە دەستگرتنەوەی (نەرفانا)ی بوزی، بۆ بەرەڵایی ڕواقییەکانی یۆنان. ئەمانەش هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ڕوناکی سروش و سروشتی خوارسکی مرۆڤ دەبێت وەك دوو باڵی باڵندە گرەویان لەسەر بکرێت بۆ فڕین، هەر وەك بەدیهێنەری یاسا سروشتییەکە و نێرەری یاسا ئاسمانییەکە، ویستویەتی. کۆتاییەکەشی بریتییە لەوەی کە "ئەگەر فەلسەفە بە تەنها بڕیار بدات لەسەر بابەتێك ئەوا گرنتی نیە بۆ لەباریی بڕیارەکە، و ئەگەر ئاوەز و سروش بەیەکەوە بڕیاریان دا ئەوا مەشخەڵانی شەو گەیشتووە بە ڕوناکی ڕۆژ، ڕوناکی لەسەر ڕوناکی، و خوداش ڕێنمایی هەرکەسێك دەکات کە خۆی بیەوێت بۆ لای ڕوناکییەکەی".

ئاین و زانست

یەکێکیتر لە دوانەییە گەورەکانی ڕوبەڕوی هزری ئیسلامی هاوچەرخ بۆتەوە بریتییە لە ئاین و زانست. ئەمیش درێژکراوەی دوانەییەکەی ئاوەز و دەقە لە کۆندا لەگەڵ جیاوازییەکی گرنگ، ئەویش ئەوەیە کە گرفتەکە لە کۆندا پەیوەست بوو بە میکانیزمەکانی ئاوەز، و لە سەردەمی هاوچەرخدا پەیوەستە بە بەرهەم و جێکەوتەکانی ئاوەز. مەودای زانیاریی زانستیی فراوان بووە لە سەردەمی هاوچەرخدا بەجۆرێك کە مرۆڤایەتیی لەم

چەشنەی بەخۆیەوە نەدیوە لە پێشتردا، مرۆڤی هاوچەرخ پڕبووە لە خۆی، و متمانەیەکی زیاد لە پێویستی بە خۆی هەیە، بەجۆرێك وای لێکردووە کەمتر هەست بە میهر و سۆزی خودا بکات، ئەمەش دیاردەیەکی مرۆییە قورئان لە یەکەم سورەتی دابەزیوی دا ئاماژەی پێدەکات"کلا ان الانسان لیطغی★ أن رءاه استغنی" واتە: مرۆڤ سەرەڕۆیی دەکات، هەر کە زانی بێنیاز بووە.

هەروەك پێشکەوتنی زانستی بووە هۆی دەرکەوتنی لایەنی لاوازیی هەندێك لە ئاینە کۆنەکان، کاتێك ئاست نزمیی لۆژیکیانی دەرخست، و دژیەکی تێڕوانینیان دەربارەی گەردون و سەرەتای زانست و بەرهەمەکانی. ئەمەش بەدگومانی دروست کرد بەرامبەر هەموو ئاینەکان لای خەڵکانێکی زۆر، بەهۆی جیا نەکردنەوەی سروشی دابەزیو لە ئاسمانەوە، لە قسەلۆکە بێبنەماکانی ئەندێشەی مرۆڤ دروستی کردون بەدرێژایی مێژوو.

زۆرێك لە بانگخوازان هەوڵیان دا بۆ قسە کردن لەسەر بابەتی ململانێی ئاین و زانست لە سەردەمی هاوچەرخ، لەگەڵ جیاوازییان لە هێزی لۆژیك و فراوانی ئاسۆیان. دکتۆر دەراز بەشدارییەکی بەبەهای هەیە لەم بوارەدا، ئەویش نوسینی کتێبی "الدین"ە و ئاماژەی بۆ ئەم بابەتە کردووە لە کتێبەکانی تریدا. دەراز ڕونی دەکاتەوە کە مەرج نیە ململانێی نێوان ئاین و زانست

هەمیشە هۆکارەکانی زانستیی بن یاخود ئاینی. دەراز بە پوختی دەڵێت کە لەنێوان زانست و ئاین دا سێ جۆر ململانێ هەیە:

یەکەم: "ئەو ململانێ ڕوکەشەی کە ناوی زانست یاخود ئاینی تێدا بەکاردەهێنرێت بۆ شاردنەوەی مەبەست و ئامانجانێکی دیکە، و حەز و ئارەزووی جۆراوجۆری وەك سامان و دەسەڵات و ناوبانگ و بەرژەوەندییە کاتییەکانی تر".

دووەم: "ململانێی ڕاستی بەردەوام لە نێوان داخوازییە ڕوحیە بەرزەکانی هۆکارن بۆ قوربانیدان و خۆجڵەوکردن و دادگەریی، لەگەڵ داخوازیە مادییەکانی دژی، کە سەردەکێشن بۆ پاشاگەردانی و بەڕەڵایی و خۆسەپاندن".

سێیەم: "ئەو ململانێ هزرییەی بە هۆکاری نیەت باشی دروست دەکرێت لەنێوان هەردوو دەستەی زانستیی و ئاینی، و هەر یەکیان دەیەوێت نکوڵی لەوەی بەرامبەری بکات و بەدرۆی بخاتەوە".

دەراز خۆی ماندوو نەکردووە بۆ دۆزینەوەی چارەسەری هزریی بۆ جۆری یەکەم و دووەم لە ململانێی زانست و ئاین، ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە یەکەمیان لە ناوەرۆکدا دارمانی ڕەوشتە، و پێویستی بە چارەسەری ڕەوشتییە نەك هزریی، و دووەمیش چارەسەری مەحاڵە. بۆیە دەراز جەخت دەکات لەسەر جۆری سێیەم و بە دەربڕی ناکۆکیی هزریی دادەنێت، لەگەڵ

هەوڵدانی هەردو لا بۆ گەیشتن بە ڕاستیی. ڕونی دەکاتەوە ئەم"ناکۆکییە هزرییەی بەهۆی نیەت پاکییەوە دەکەوێتە نێوان لایەنگرانی ئاین و لایەنگرانی زانست" لە دوو وێنەدا خۆی نمایش دەکات:

وێنەی یەکەم: ناکۆکی دەقەکانی ئاین لەگەڵ ڕاستییەکانی زانست، ئەمەش "بەوەی بابەتێك یاخود چەند بابەتێکی دیاریکراو هەبێت کە ئاین و زانست دوو بڕیاری جودایان هەبێت لەسەریان. ئەمیش کاتێك ڕوودەدات کە ئاین باسی-لەگەڵ پێکهاتە ڕوحیەکەی- بابەتانێکی زانستیی و ڕاستیی بینراوەکان بکات، و ڕێبازێکی دیاریکراو بۆ خۆی هەڵبژێرێت، و بیسەپێنێت بەسەر ئایندارانداا". ئەم بارە کرۆکی ناکۆکییەکە کە چەند ئاینێکی هەڵکەند لە دڵی شوێنکەوتوانی بەهۆی ئەو بڕیارانەی کە دژ و ناکۆکن بە ئاشکرایی لەگەڵ ڕاستییانێك زانست دۆزیونیەتیەوە لە سەردەمی هاوچەرخ. دژیەکی و ناکۆکی لەم بوارەدا لەنێوان ئاین و زانست "پێوەری زانینی پشکی باش و خراپییە لە هەر ئاینێکدا، بەگوێرەی ڕێککەوتن و هاوتەریب بوونی لەگەڵ ڕاستییە زانستییەکان و بابەتەکانی هزری دروست". کورتەی قسان لەمەدا بریتییە لەوەی "ئەگەر ئاین ڕاست بێت و زانستیش ڕاست بێت ئەوا پێویستە یەکتری پشتڕاست بکەنەوە و پشتگیریی بکەن. بەڵام ئەگەر پشت تێکردن و بەدرۆخستنەوە بوو ئەوا بێگومان

یەکێکیان پوچ و گومڕاییە" چوون بەڵگە نەویستە کە ڕاست هەرگیز دژی ڕاست نابێت.

وێنەی دووەم: لەخۆبایی بوون لای هەڵگرانی زانست یاخود هەڵگرانی ئاین، و تێپەڕاندنی سنور لەلایەن دەستەیەکیانەوە، بە نکوڵی کردن لەوەی لای بەرامبەرە لە ڕاستیی"نەك بەهۆی ئەوەی بەڵگەی بەهێزی لایە بۆ پوچەڵ کردنەوەی، یاخود گومانێك کە لاوازی دەکات، بەڵکو هەڕەمەکیی، یاخود بەهۆی نەزانیی، و گومان بردنی کە هەرچی لە بازنەی زانستی ئەودا نەبوو ئەوا ڕاست نیە".

دەراز دەربارەی ئەمە دەڵێت:"هاوار بە ماڵم ئەمە کورت بینییە، و بگرە نەزانی و لەخۆبایی بوونە، چوون بەدرۆ خستنەوەی ئەوەی مرۆڤ پەی پێنەبردووە و ماناکەی بەتەواوی بۆ نەهاتووە، هەڵەیەکە کە خاوەن زانستان لە زانایانی زانستی ئەزمونی و زانایانی ئاینییش تێی ناکەون، بەڵکو لەخۆباییانی خەڵکی ئاسایی یاخود نیمچە خوێنەواران تێیدەکەون". چارەسەری ئەم لەخۆبایی بوونەش-لە دیدگای دەرازەوە- بریتییە لە :"هەموو مرۆڤێك ڕێز و سنوری خۆی بزانێت، و لەو سنورە تێپەڕ نەکات...و هۆکاری گونجاویش بۆ ئەمە ئەوەیە کە هەر دەستەیەك بەشەکەی خۆی بسەلمێنێت، و نکوڵی ئەوە نەکات کە لای دەستەکەیترە".

له گرنگترینی نمونەکانی لەخۆبایی بوونی ئاینی له ڕووی زانستدا: ئەو بانگەشانه بوو کەنیسه دەیکرد له سەرەتای سەردەمی ڕاپەڕینی ئەوروپی دەربارەی پێکهاتەی فیزیایی گەردون، و قایل نەبوون به ڕاستییه زانستییه نوێیەکانی گالیلۆ و زاناکانی دیکەی گەردونناس و فیزیایی پێیگەیشتن، بەڵکو دەستدرێژی کردنه سەریان و سوتاندنی هەندێکیان به زیندویی.

هەرچی لەخۆبایی بوونی زانستیشه بەڕووی ئاین، ئەوا لەو نمونانەی دەراز گرنگی پێداوه، ڕێبازی دانراوە-المذهب الوضعي- که فەیلەسوفی فەرەنسی ئۆگۆست کۆنت (١٧٩٨-١٨٥٧) به شان و باڵیدا دەوت له کاتی قسه کردنی لەسەر تیۆرەکەی دەربارەی سێ قۆناغەکەی هزریی مرۆیی. کۆنت پەرەسەندنی هزری مرۆیی دابەش دەکات بۆ سێ قۆناغ له ڕووی کاتەوه: قۆناغی فەلسەفەی ئاینی، پاشان قۆناغی فەلسەفەی داماڵین-الفلسفة التجريدية-، پاشان قۆناغی فەلسەفەی واقیعی یاخود زانستیی.، که قۆناغانێکن هەر یەکیان جێی ئەوەی پێش خۆی دەگرێتەوه و دەیسڕێتەوه.

بەمەش کۆنت بانگەشه دەکات که قۆناغی هزری ئاینی"نمونەی باری سەرەتاییه که مرۆڤایەتیی له چاخی منداڵییان دا گاڵته و گەپیان پێدەکرد، و کاتێك گەوره بوو ئەو کۆتەی له ملی کردەوه، و گۆڕی به بەرگێکی مامناوەند له

سەردەمی هەرزەییدا، و کاتێك گەیشتە سەردەمی ژیریی و عەقلی پێگەیشت، ئەوا بەرگی کۆتایی پۆشی لە زانستە ئەزموونییەکان".
بە پێی ئەم تێڕوانینە، زانست جێی ئاینی گرتەوە و کاریگەرییەکانی پوچەڵ کردەوە، و ئاین تایبەتە بە سەردەمێکی ئەندێشەیی، و زانست پێشەنگ و پێشەوا و ڕێنماییکاری داهاتووی مرۆڤایەتییە.

دەراز پایەکانی ئەم تیۆرە پەرەسەندنیەی هەڵوەشاندنەوە بە بەڵگەی باوەڕپێکەر، بەم چەشنەی خوارەوە:

یەك: "ئەو سێ قۆناغەی کۆنت باسی دەکات، وێنەی ڕۆڵی مێژووی بەدوای یەکدا هاتوو نابینێت، بەڵکو وێنەی کۆمەڵە و ڕەوتە هاوچەرخەکانی ناو هەموو گەلێکن"بگرە لە هەموو سەردەمێکدا، بۆیە ئەوە واتای پەرەسەندن نادات وەك کۆنت وێنای دەکات.

دوو: ڕێکخستنی دروستی ئەم دیاردانە بریتییە لەوەی بڵێین ئەو قۆناغی واقیعییەی کۆنت دەیکاتە کۆتا قۆناغ و بەرزترینیان، بریتییە لە"قۆناغی منداڵیی دەروونی، نەك قۆناغی پێگەیشتن و کەماڵ. چونکە داخوازی پێویستیی پەلە و پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەیە، و کاری هەستەکانە نەك هزر، و لە ڕەگەزی بەراوردکاریی و کاردانەوەیە، نەك ڕەگەزی چالاکیی و دامەزراندن".

سێ: دیدی ئاینیی له داکەوتدا بریتییه له بەرزترین جۆرەکانی هزری مرۆیی و له هەموو ئەوانیتر بێ لایەنتر و ماقوڵترە. چونکه ئەو"له دەروندا لەدایك نابێت تا ئاسۆی فراوان نەبێت، و گەردونی دیار و پەنهان تێنەپەڕێنێت بۆ پشتی ئەو گەردونه، بۆیه دیدی ئاینی فراوانترین بواری هەیه، و دورترین داخوازییش".

بەم چەشنه، دەراز، ئەو بنەما کاتییەی کۆنت کردویەتییه بناغەی دابەش کردنەکەی، هەڵدەوەشێنێتەوە، و بابەتەکان دەخاتەوە سەر ڕێڕەوی دروستی خۆیان. چوون ئەوەی کۆنت وەك قۆناغیی کاتیی دەیبینێت له پەرەسەندنی هزری مرۆیی له ڕاستییدا بریتییه له پێویستییەکانی هزری مرۆیی له هەموو چاخێکدا:"پێویستیی هەست، پاشان پێویستیی ئاوەزی ئاسایی، دواجار پێویستیی ئاوەزی باڵا".

لەو بەڵگانەی پێشنیازەکەی دەراز پشتئەستور دەکەن ئەوەیه: پەرەسەندنی زانست له سەدەی بیست و بیست و یەکدا وای کرد زانایان خۆبەکەمزان بن و کەمتر خۆیان هەڵبنێن بەراورد به زانایانی سەدەی نۆزده که هاوسەردەمی کۆنت بوون. بۆیه "زیاد بوونی زانست و زانیاریی هۆکارێك بوو بۆ گەشه کردنی حەزی ئاینداریی"، نەك هۆکار بێت بۆ دەستبەردار بوونی ئاینداریی هاوشێوەی ئەوەی له سەردەمی کۆنت دەگوزەرا. پاشان

"پێشکەوتنی بێ وچانمان لە زانستدا نزیکمان دەخاتەوە لە داننانمان بە نەزانیمان...چونکە زانست هەر دەروازەیەکی نوێی بەڵگەکانی گەورەیی و فراوانی گەردون دەکاتەوە، لەگەڵیدا ئاسۆی گەورەتری پرسیار دەکرێتەوە....و بەم پێیە فراوان بوونی بواری زانراوەکان بریتیی بوو لە فراوان بوونی بواری نەزانین".

قسەکانی دەراز لێرەدا سەبارەت بە زانست و ئاین گشتیی و بێ لایەنن، و ئاینی ئیسلامی تایبەت نەکردووە بە ئاماژە بۆکردنێکی تایبەتی ڕاستەوخۆ. بۆیە دەبێت ئەوەش زیاد بکەین بۆ قسەکانی کە ئاینی ئیسلام گەورەیی و ڕەسەنیی خوداییانەی خۆیی سەلماند بەو هاوجوت بوونەی نێوان ئاماژە زانستییەکانی قورئان کە هەزار و چوار سەد ساڵ پێش ئێستا هاتووەتە خوار و دۆزینەوەکانی زانست لە سەردەمی هاوچەرخدا. بۆیە بابەتی ئیعجازی زانستیی لە قورئان دا بووە زانستێکی سەربەخۆ لە سەردەمی ئێستامان، و ژمارەیەك لە زانایانی ڕۆژاوا موسوڵمان بوون بەهۆی ئەم ئیعجازەی بە هیچ جۆرێك ڕاڤە ناکرێت بەوەی بیگێڕینەوە بۆ سەرچاوەیەکی مرۆیی. لە بەناوبانگترینی ئەو کەسانەش پزیشکی فەرەنسیی"مۆریس بۆکای"ی دانەری کتێبی"تەورات و ئینجیل و قورئان و زانست: دەقە پیرۆزەکان لەژێر ڕۆشنایی زانستی نوێ"و کتێبی"بیرکردنەوانێك لە قورئان".

دەراز ئاگاهی دەدات لە بابەتێکی گرنگ، زۆرێك بێ ئاگان لێی، هەتا لەناو دڵسۆزان و مشورخۆرانی بابەتەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان دا، ئەویش جیاوازی زانست و ئاینە لە بابەت و ئامانج دا. ئامانجی ئاین بریتییە لە ناسینی خودا و وەرگرتنی ڕێنمایی و ڕێنمونی لێی، و ئامانجی زانستیش زانینی گەردون و ڕام کردنیەتی بۆ مرۆڤ. ئەگەر ئاین باسی بابەتێکی زانستیی کرد ئەوە دەبێت"وەك حاڵەتێکی ناکاو-عرضي- تەماشا بکرێت... شێوازەکەیشی زۆربەی کات بریتییە لەوەی ئامرازە نەك مەبەست و ئامانج" وەك سەرنجڕاکێشان بۆ لای جوانی بەدیهێنان و ناوازەیی دروست کردنی کە بەڵگەن لەسەر بوونی بەدیهێنەر و تاك و تەنهایی و میهرەبانیی.

کاتێك پسپۆرێك لە پسۆڕانی زانستە ئەزمونیەکان باسی بابەتانێکی ئاین دەکات، ئەوە هەڵێنجانێکی فەلسەفی و ڕەوشتییە لە زانست، نەك بەشێك بێت لە زانستەکە خۆی، چونکە بابەتی زانست بریتییە لە جیهانیی مادە بەتەنها. بەڵام ئەم جیاوازییە لەنێوان بابەتی زانست و ئاین بە مانای دژیەکیی نایەت، بەڵکو جیاکارییە، و لەکۆتاییدا هەردوکیان-بگرە سەرجەم زانست و زانیارییەکان- کۆکن لەسەر هەمان ئامانج کە گەڕانە بەدوای ڕاستیی، و ڕاستییش لەگەڵ ڕاستیی دژ نابێت.

دەراز جیاکارییەکی مەنهەجی دەکات لەنێوان پلەکانی زانست و زانینی مرۆیی، و پلەبەندیی کردون لەسەر بنەمای ڕاستیی ڕەهای گەیەنەر بە خودا، و گەیشتە ئەوەی"نزمترین ئاستیان خزمەتکارە و خزمەتکراو نیە، و بەدوایدا ئەوەیە کە خزمەتکارە و خزمەتکراویشە بە پلەی جیاواز...بەجۆرێك تا دەگاتە ئەوەی بابەتی باڵای زانستە، و خزمەتکراوە و خزمەتکار نیە" ئەویش ناسینی خودای گەورەیە.

هەرچی "زانستی باڵا"یشە ئەوا بریتییە لە زانینی ئاینی ڕاست، چوون ئەوە بەڕێزترین زانستە، و بەهۆی ماقوڵی ئامانجەکەی، و پەیوەستیی بە ڕاستییە هەمیشەییەکان و واتای ژیانەوە، "چ ئامانجێك هێندەی ویستی فێرخواز گرنگە بۆ گەڕانی بەدوای ڕاستیی هەمیشەیی کە بە لەناو چوونی دونیاش لەناو ناچێت، و ڕاستیی ڕەهای پێوەرە بۆ شتەکانی تر و خۆی بە هیچ شتێك ناپێورێت".

لەدوای ئاشکرا کردنی پلەبەندی زانیارییە مرۆییەکان، و ئاشکرا کردنی جیاوازیی ئاین و زانست لە بابەت و ئامانج دا، دەکرێت ئێستا بڕوانینە شێوازی گونجاوی پەیوەندی نێوان ئەو دووە. لەم بوارەدا دەراز پێی وایە باشترین پەیوەندی نێوان ئاین و زانست بریتییە لە "هاریکاریی". ئەگەر هاریکارییش نەبوو ئەوا لانی کەم "لێك تێگەیشتن و دراوسێیەتی باش" بۆ بەرژەوەندی

هەردوولا. بەڵام ململانێ لەنێوان ئاینی ڕاست و زانستی ڕاست ئەوا بە هیچ جۆرێك بوونی نیە لای دەراز، "چوون ڕاستیی هەرگیز دژی ڕاستیی نیە، ناگونجێت دژیەکی لەنێوان دوو شتدا هەبێت کە هاوبەش نین لە بابەت دا".

دەراز گرنگی "لێك تێگەیشتن و دراوسێیەتی باش" ئاشکرا دەکات لە نێوان زانست و ئاین، لەگەڵ بەرهەمی چاکی بۆ هەردولا. ئەو بەرهەمەی بۆ ئاین فەراهەم دێت لەلایەن زانستەوە بریتییە لەوەی زانست-بەو دۆزینەوانەی لەخۆی دەگرێت سەبارەت بە جیهانی بینراو- ڕێخۆش دەکات بۆ ئاوەز تا باوەڕ بێنێت بە جیهانی نەبینراو:"هەر وەك چۆن ناگەینە نەزانراو مەگەر لە ڕێی زانراوەوە بێت، و {شت یان کەسی} دووریش پەی پێنابرێت مەگەر لە ڕێی {شت یان کەسێکی} ئامادەوە بێت، هەر بەم چەشنە ڕاستییە باڵاکانیش ئاسان نیە گەیشتن پێیان مەگەر لە ڕێی ڕاستییە نزمەکانەوە بێت".

کەمترینی سودی ئاین لە زانست بریتییە لە چێژ وەرگرتن لەو کەشەی پێشکەوتنی زانستی بەرهەمی دێنێت لە بارودۆخێکی هزریی دروست کە جێی وەهم و ئەفسانەی تێدا نابێتەوە، و پاککەرەوەی جۆرەکانی بیروباوەڕیشە. زانستە سروشتی و مرۆییەکان"بە ڕەواندنەوەی تاریکییەکانی وەهم، و بڵاوکردنەوەی ڕوناکی بەناو دەروندا، کاری پاککردنەوە و بژارکردن دەکات،

پێویستی بە کەشێکی هزریی لەبار هەیە بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕی دروست. بەجۆرێك ئەگەر دڵ پاڵێدایە لای شتێك ئەوا پاڵدانێك بێت لەسەر بەرچاو ڕوونی و بەڵگە، نەك نەزانیی پاڵنەری بێت، یاخود جلەوی بەدەستی سادەییەکی گێل ئاساوە بێت".

بەرهەمی ئاینیش بۆ زانست گرنگییەکەی کەمتر نیە، کە بریتییە لە تەواوکاریی کەموکورتییەکانی زانست، و ئاسۆی تیۆریی مرۆڤ فراوان دەکات بۆ پشتی ئەو گەردوونە مادییەی کە زانست دەیەوێت تێی بگات و ڕاڤەی بکات. بۆ بەدیهێنانی ئەم بەرهەم و بەرژەوەندییە دولایەنەیەی نێوان زانست و ئاین، دەراز پێی وایە"ئەگەر ئەرکی ئاینەکان بریتی بێت لە دانوستان لەگەڵ زانست و نەبێزراندنی، و باشتر بێت بۆمان سود لە تەواوی زانیارییە مرۆییەکان وەرگرین و خۆمان پڕچەك بکەین بە ئەنجامەکانی، ئەوا باشترە بۆ زانستیش بوار بدات ئاین کەموکورتییەکانی بۆ تەواو بکات، و ئەو بۆشاییەی لە دەروندا دروستی دەکات، ئاین بۆی پڕ بکاتەوە، بە ڕاستییەکانی گیان-روح-. ئەگەر{زانست} وای نەکرد ئەوا لانی کەم بێ لایەن بێت، و دژایەتی ئاین نەکات و نکوڵییان لێنەکات بە گشتی، چوون نکوڵی کردنی گشتگیرانەی ئاین نکوڵی کردنە لە شتانێکی واقیعی کە ئاین لە خۆی دەگرێت، و لە زانست دا نیە، ئەوانیش ڕەگەزەکانی باوەڕە بە ڕاستیی باڵا و بە پیرۆز زانینی و پەرستنیەتی".

بێباوەڕانی زانای بواری زانستی سروشتی کەسانێکن ئاسۆیان نیە، لەبەر ئەوەی"ئەمەکیان بۆ زانستەکەیان وایان لێدەکات هەوڵ نەدەن بۆ تێپەڕاندنی سنورەکانی، دەرچون بۆ گەیشتن بە شتێك کە چاویان پەی پێنابات". ئەگەر سەرت سوڕما ئەوا با سەرسوڕمانت لە زانستێك بێت کە سەرقافڵەیە بەرەو نەزانی، و ڕوناکییەك خاوەنەکەی زیندانی بکات لە تاریکە شەودا.

**جەبر و ئیختیار**[1]

ئاینە ئاسمانییەکان لەسەر پرنسیپی وەبیر هێنانەوەی مرۆڤ دادەمەزرێت بە ڕێزی مرۆڤ بوونی، و هاندانی بۆ دەرچون لەوەی پێی ڕاهاتووە، و گۆڕینی خۆی و دەوروبەرەکەیشی. بەم شێوەیە"ئاینەکان لە هەموو وێناکانیدا پشتگیریی هیوا و توانا، و ئازادی و هەڵبژاردنی خۆویستانە-ئیختیار- دەکات لە دەستپێکی کار و شتەکان دا".

لە ئاینە ئاسمانییەکان دا ئەو دەنگە خوداییە بەرجەستە دەبێت کە بانگ لە قوڵایی گیانی مرۆڤ دەکات"لە هاندانی بۆ تەواوکردنی سروشتی خوارِسکی، و هۆشدرایی دەداتێ لە ڕوانین

---

[1] لێرە و لە هەر شوێنێکی دیکەی ئەم کتێبەدا ئەم دوو دەربڕینە دوبارە بۆوە ئەوە لەبەر ئەوەی کە دوو وشە یان دەربڕینی پڕاوپڕ یاخود نزیکیشم نەدۆزیوەتەوە تا ئێستا لە زمانی کوردیدا تا بۆیان بەکار بێنم، داوای لێبوردن لە خوێنەر و زمانی کوردیش دەکەم ئەگەر کەمتەرخەمیی لە من بێت-وەرگێڕ-

**تەنها لە ئێستای شتەکان و ئێستای خۆی، بۆ تامەزرۆ بوون بۆ سەرەتا و دەستپێکی شتەکان و کۆتاییەکەیان هەروەها سەرەتا و دەستپێکی خۆی و کۆتایی". ئاین مرۆڤ فێری بەرپرسیارێتی دەکات، بەرپرسیارێتییش خوازیاری ئازادییە.**

**بەڵام "گرفتی ئازادی لە سەرەتای بوونی مرۆڤایەتییەوە دوو تیۆرەی وروژاندووە کە تا ئەوپەڕی دژبوون، دژیەکن، لانی کەم لە بواری داماڵین دا: حەتمی و ناحەتمی-الحتمية و اللاحتمية-". جا ئاینە ئاسمانییەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر توانای خوای گەورە و پەی بردنی بە هەموو شتێك لە ڕووی زانست و تواناوە، لەگەڵ جەخت کردن لەسەر ئازادی مرۆڤ و بەرپرسیاریەتی لە کردارەکانی. کەواتە چۆن دەتوانین ئەم دوو پرنسیپە بسازێنین کە باوەڕی لەسەر دادەمەزرێت ئەوانیش باوەڕ بە خودا و بەرپرسیارێتی دروستکراوان؟ ئەوە باسێکە هزرە فەلسەفی و ڕەوشتییەکانی ناچار کردووە بە دۆشدامان بەدرێژایی سەردەمان، و لەو دوانانەیشە هزری موسوڵمانانی سەرقاڵ کردووە، و ڕێبازی کۆمەڵە ئیسلامییەکانی پەرت کردووە بۆ چەندین شێواز.**

**دەراز قسەی خۆیی لەسەر ئەم بابەتە کردووە لە چەند جێیەکی کتێبەکەی (دستور الاخلاق في القران) بەو پێیەی ڕەوشت چ جۆرە بەرپرسیاریەتی و ئەرکێك دەهێنێتە ئاراوە...ئەمانەش هەموو بابەتانێکی پەیوەستن بە بابەتی جەبر**

و ئیختیار. بۆیە ئاشکرای دەکات کە پابەندیی ڕەوشتیی نابێت ناچاریی بێت، چونکە بەو شێوەیە"سیفەتی ڕەوشتیی بوونی لەدەست دەدات" چونکە تەنها لە کاتێك دا کارێك وەسف دەکرێت بە ڕەوشتیی کە مرۆڤ بژاردەی هەبێت بۆ کردن و نەکردنی. بەڵام ئایا مرۆڤ بەڕاستی ئازادە لە کردن و نەکردن؟ ئایا دەورە نەدراوە بە چوارچێوەیەکی فیزیایی و دەرونی کە هەڵسوکەوتەکانی دیاریی دەکات و دەیسەپێنێت بەسەریدا؟ لێرەدا فەیلەسوفان و ڕەوشتناسان دابەش بوون بەسەر دوو ڕێبازی سەرەکیدا ئەوانیش ڕێبازی جەبر و ڕێبازی ئیختیار.

هەرچی ئەوانەی باوەڕیان بە ڕێبازی جەبرە ئەوا هیچ ئازادییەك بۆ مرۆڤ نابینین تەنها خۆخەڵەتاندن نەبێت، بەجۆرێك هیومی فەیلەسوف دەڵێت"هەست کردنمان بە ئازادی تەنها وەهمە". و دەراز خاوەنی ئەم بیرەی بە (الحتمیین) ناوبردووە، و ئاشکرای دەکات کە گرفتیان ئەوەیە: باوەڕیان وایە بەدیهێنانی مرۆڤ جێگیر و نەگۆڕە، بەجۆرێك"الحتمیون سروشتی خواڕسك دەخەنە چوارچێوەیەکی زۆر یەکلای نەگۆڕەوە، هیچ نەرمی و نیانییەك لەخۆی ناگرێت. حەزە باش یا خراپەکانی لەگەڵ خۆمانی دەهێنین لەکاتی لەدایك بوونەوە، ئەوە سروشتمانە، جا چۆن دەبێت بەرپرسیار بین لە سروشتێك کە ئێمە دروستمان نەکردووە، یاخود بەهەر جۆرێك بێت ئەوا ئێمە

به هەست و ویستی خۆمان دروستمان نەکردووە"؟ ئەوان لێرەدا مرۆڤ دەچوێنن بە ئاژەڵ لە ژیانی هەستی و هزریی کە زۆر لە چوارچێوەی خواستە جەستەییەکان دەرناچێت. شۆپنهاوەری فەیلەسوف دەربارەی ئەم چواندنە دەڵێت"کەسانێك هەن باشن و کەسانێکیش خراپ، ئەمەش وەك چۆن مەڕ و پڵنگ هەیە تاقمی یەکەم بە هەستێکی مرۆڤدۆستییەوە لەدایك دەبن و تاقمی دووەمیش بە هەستێکی خۆپەرستییەوە".

هەرچی هەلگرانی ڕێبازی ئیختیاریشە ئەوا دەڵێن مرۆڤ بەتەواوی ئازادە ئازادە، و خودا بەو سیفەتەوە بەدیهێناوە، وەك ئامادەکردنی بۆ هەڵگرتنی ئەو بەرپرسیارێتییەی پێیداوە. کاتێکیش دەڵێن ئازادی لە ئیختیاری مرۆڤ دا ئەوا مەبەستیان لە "ئازادی جێبەجێ کردن" نیە چوون ئەوە ڕێژەییە، و سنوردارە بە بارودۆخی کات و شوێن، بەڵکو مەبەستیان لە "ئازادی دانپێدانانە-حرية التقرير-"و ئازادی ڕەوشتیی بێ زۆرلێکردن.

موسوڵمانانی سەدەی یەکەم لەسەر باسی جەبر و ئیختیار نەوەستاون چونکە پێیان وابوو"ئاقڵانە نیە و بێ سودە" مادام سەرجەم موسوڵمانان کۆکن لەسەر بەرپرسیاریەتی مرۆڤ لەسەر کردارەکانی. بەڵام لەگەڵ دەستپێکی سەدەی دووەم، و هاتنی ئەم باسە لە دیانەتەکانی پێشو و فەلسەفەی کۆنەوە بۆ ناو ڕۆشنبیریی ئیسلامیی، ئەم دیاردەیە سەریهەڵدا و قسە کردنیش

لێی زۆر بوو. یەکێك لە شتە خۆشەکانیشی ئەوە بوو کە دوو کۆمەڵەی زۆر دژیەك لە قسە کردن لەسەر بابەتی ئازادیی و بەرپرسیاریەتیی، هەمان نازناویان هەبوو کە "القدرية" بوو بەڵام بە دوو واتای تەواو دژ. پاشان نازناوەکان دواتر گۆڕان و یەکێکیان بووە "المعتزلة" و ئەویتر بووە "الجهمية".

کۆمەڵەی موعتەزیلە بونە خاوەنی ڕێبازی ئیختیار لەڕێی دامەزرێنەرەکەی کە (واصل بن عطاء) بوو و پێی وابوو "بێگومان خودا دەزانێت مرۆڤ ئەو توانایانەی خودا پێی داوە لە چ بوار و بە چ شێوازێك بەکاری دەهێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا لێی دەگەڕێت، لەژێر بەرپرسیاریەتی تەواوی خۆیدا چی دەوێت، بیکات" بەم شێوەیە واصل چەمکی "القدر-واتە ئەندازەگیریی-"ی لە دەقە شەرعییەکان دا یەکسان کردوە لە واتاکەیدا بە چەمکی زانیاریی پێشوەختی خودا، یاخود چەمکی ڕێسا گەردونیەکان کە کاری مرۆڤ سنوردار دەکات بە چوارچێوەیەکی ڕێکخەر، بەڵام ویست و ئازادیی لێناسێنێتەوە. هەرچی جەهمییەکانن ئەوا بەپێچەوانەی ئەمانەوە باوەڕیان بە "الحتمية المطلقة" هەیە، چوون (جهم بن صفوان) دامەزرێنەری ئەم کۆمەڵەیە و بەناوی خۆیشیەوە ناونرا،"پێی وابوو کە کرداری خۆویست و خۆنەویست تەنها لە ڕووی دەرەوە جودان، لەبەر ئەوەی مرۆڤ بێدەسەڵاتە لە

ئەنجامدانی سەربەخۆیانەی هەر کردارێك، بەڵکو خودا هەڵیدەسوڕێنێت وەك چۆن با پەڕێك دەهێنێت و دەبا".

لەڕاستییدا گفتوگۆ لەسەر بابەتی جەبر و ئیختیار درێژکراوەی گفتوگۆیەکی دیکەی گەورەتر و قوڵترە سەبارەت بە سیفاتی خودا. کرۆکی ڕاجیایی لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵەیە بریتییە لە ڕاجیایی لەسەر پێداگریی لە سیفەتی توانای خودا یاخود پێداگریی لەسەر دادگەریی خودا. ئەوانەی پێداگریی لەسەر سیفەتی توانایی دەکەن لەسەر حسابی دادگەریی ئەوا بەرەو ڕێبازی جەبر دەچن، و ئەوانەش پێداگریی لەسەر دادگەریی دەکەن لەسەر حسابی توانایی ئەوا بەرەو ڕێبازی ئیختیار دەچن. هەردوو بۆچونەکەش هەڵەی تێدایە کاتێك پێداگریی دەکات لە سیفەتێکی خودا لەسەر حسابی سیفەتێکی تری خودا، لەکاتێکدا بنەما لای باوەڕدارێکی یەکخواپەرست ئەوەیە ئەم بابەتە نەکاتە دوو بەشەوە، بەڵکو دەبێت وەك گشتێکی یەکپارچە وەریگرێت.

بەڵام ڕێبازی جەبر و حەتمی خاڵی لاوازیی قوڵتری هەیە لە بونیادی دا: لەوانەش خاڵی لاوازیی زانستیی کە بریتییە لە "زانستی دەروونناسی هاوچەرخ دەیسەلمێنێت پێچەوانەی ئەمە ڕاستە کە ئارەزوەکانی مرۆڤ کەمتر چەسپاون، و ئەگەری گۆڕین و پەروەردە کردنیان زۆرترە... بەراورد بە ئارەزوەکانی ئاژەڵ،

بەهۆی زۆر ئالۆزییەوە''. خاڵی لاوازی ڕەوشتیی، ئەویش بە وتنی جەبر هەموو بناغەیەکی تیۆریی پابەندبوونی ڕەوشتیی، دەڕوخێت، و دەرگا دەکرێتەوە بۆ لۆژیکی هێز و یاسای دارستان.

ئەشعەرییەکان قۆڵیان لێهەڵماڵی بۆ بەرپەرچدانەوەی هەردوو ڕێبازەکە، بەتایبەتی موعتەزیلە، و گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی بڵێن ویستی خودا و مرۆڤ هاوبەشن لە کردارەکەدا، لەڕێی تیۆرەکەیانەوە بەناوی''الکسب-بەدەستهێنان-''، بەڵام هەندێك لە ئەشعەرییەکان جاروبار کەوتونەتە کاردانەوەوە لەبەرامبەری موعتەزیلە، و بەهۆی تێپەڕاندنی موعتەزیلەوە ئەوانیش تێیان پەڕاندووە، هەروەك لە وتەی هەندێکیان دەبینرێت گوایە تەکلیفێك کە لە توانادا نەبێت دروستە، بەڵکو دەڵێن بە کرداری ڕویداوە...و جگە لەمانەیش لەو ڕۆچونانەی هۆکارەکەی-وەك دەراز دەڵێت-ئەشعەرییەکان''کەمتەرخەمبوون لە بونیادنانی زەمینەیەکی فەلسەفیی جێگیر'' جودا لە موعتەزیلە کە کۆك بوون لەگەڵ بۆچونەکانیان، سەرەڕای زیادەڕەوییەکانیان.

بەڵام زیانی گەورە لەم هەموو ڕێبازەدا بریتییە لە کەمتەرخەمی لە کۆڵینەوەی جدی بۆ چارەسەری قورئانیی بۆ ئەم گرفتە فەلسەفییە ڕەوشتییە. دەراز کە تێڕوانینەکەی دامەزراندووە لەسەر کۆکردنەوەی ئایەتەکانی قورئان، ئەوا گەیشتووەتە ئاوێتەیەکی ناوازە بۆ بابەتەکە. ئەو پێی وایە کە

بابەتەکە نابێت بکرێتە دوو بەشەوە، چوون قورئان واتاکانی: ئازادی و بەرپرسیاریەتی، جەبر و ئیختیار، دادگەریی و توانایی، کۆدەکاتەوە لە هەمان چێوەدا. بەم چەشنە دەبینین"قورئان پابەندە بە ڕاگەیاندنی بەرپرسیارییەتیمان لای خودا لە هەمان ئەو ئایەتانەی ویستی مرۆڤ دەکاتە پاشکۆی ویستی خودایی، بەشێوازێکی تەواو. خودا فەرمووی:﴿يضل من يشاء و يهدي من يشاء و لتسئلن عما كنتم تعملون﴾".

بۆیە دەبێت بگەینە چارەسەرێك کە هیچ یەکێك لە واتاکانی دادگەریی و توانایی-کە بە یەکەم تێڕوانین وا دەردەکەوێت دژیەك بن- بەفیڕۆ نەدات، دەبێت"چارەسەرێکی قورئانیی و بونیادنەر بدۆزینەوە، سازان بکات لەنێوان سیفاتە ناکۆکەکان، بێ ئەوی هیچیان پشتگوێ بخات، یاخود بێ ئەوەی زیادەڕەوی بکات لە پشتبەستن بە یەکێکیان و وەرگرتنی تەنها وی".

پوختەی ئەم چارەسەرە نایابە نێوەندگیرەی دەراز پێشنیازی دەکات، بریتییە لەوەی ئەو ئایەتانەی جەخت دەکەنەوە لەسەر توانایی خودای گەورە سنوردارن بەو ئایەتانەی جەخت دەکەنەوە لەسەر دادگەریی خودا، چوون قورئان فێرمان دەکات کە ﴿الله يحكم ما يريد﴾ بەڵام تایبەتی دەکات بە فەرمایشتی:﴿والله يقضي بالحق﴾، قورئان ڕایدەگەیەنێت:﴿عذابي اصيب به من أشاء﴾ بەڵام تایبەتمەندی دەکات بە فەرمایشتی﴿ما يفعل الله بعذابكم إن

شكرتم و ءامنتم و كان الله شاكرا عليما﴾ و قورئان جەخت دەكاتەوە كە خودا ﴿يُضل به كثيرا﴾ بەڵام تايبەتى دەكات لە هەمان ئايەتدا بە فەرمايشتى ﴿و ما يُضل به الا الفاسقين﴾.

لە هەر يەك لەم سێ نمونەيەدا دەبينين ئايەتى يەكەم گشتگیرە و جەخت دەكاتەوە لەسەر واتاكانى توانايى ڕەها بێ تايبەتمەند كردن، لە كاتێكدا دەبينين ئايەتى دووەم واتاكانى توانايى تايبەتمەند دەكات بە واتاكانى دادگەرييەوە. ئەم ئاوێتە كردنە لەنێوان توانايى و دادگەريى، لەنێوان گشتگیر و تايبەتمەند، وامان لێدەكات سازان بكەين لەنێوان ئايەتەكانى قورئان، و ئەنجامگیريى بە چارەسەرێكى مامناوەنديى ناوازە بۆ بابەتى جەبر و ئيختيار-و ئەگەرى تەكليف كردن بە شتانێكى مەحاڵ- بريتييە لە ئايەتانێكى تايبەتكراوى و مەرجدار، كە ناكرێت بە گشتگیريى و ڕەهايى وەربگیرێن، دوور لە ئەو ئايەتانەى تايبەتيان دەكەن.

دەربارەى ئەمەش دەراز دەڵێت:"كاتێك {قورئان} دەفەرموێت خودا دەتوانێت سەرجەم مرۆڤەكان لەناو ببات، گوێڕايەڵ و تاوانبار:﴿فمن يملك من الله شيئا إن أراد أن يهلك المسيح آبن مريم و أمه و من في الأرض جميعا﴾ ياخود كاتێك ڕايدەگەيەنێت هيچ شتێك لەم گەردونەدا ناتوانێت دژ بێت بەو ئەركە گران و قورسانەى لەسەرمانە، و ئەو تاقى كردنەوانەى بەسەرمان

دێت:﴿و لو شاء الله لأعنتكم﴾، ئایا ئەمە ڕوون نیە کە ئەم نمونە مەرجدارە نەبووەتە واقع و نەهاتۆتە دی؟"

ئەم تێبینییەی دەراز زۆر لێرەدا زۆر بە بەهایە، چوون یەکێك لەو شتانەی لە ئاین دا بەڵگە نەویستە کە خودا مەسیحی کوڕی مەریەم و دایکی (سەلامی خوایان لەسەر) لەناو نابات، بەڵکو ئایەتەکە جەخت کردنەوەیە لەسەر سیفەتی توانایی ڕەهای خودا، بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێت:﴿و لله ملك السماوات و الأرض و ما بينهما يخلق ما يشاء و الله على كل شئ قدير﴾. ئەگەر سیفەتی توانایی خودا واتای تیۆریی بریتیی بێت لە لەناوبردنی عیسا و دایکی، و بەزۆر بەندایەتیی پێکردنی خودا بۆ باوەڕداران، ئەوا دوو سیفەتی دادگەریی و دانایی ڕێگرن بۆ بەکردار بوونی ئەم حاڵەتە. سیفاتی دادگەریی و دانایی خودای گەورە ڕێ نادات بە لەناوبردنی ڕاستگۆیان یاخود زۆرکردن لە باوەڕداران:﴿و لو شاء الله لأعنتكم إن الله عزيز حكيم﴾.

ئەوە ئەو پوختە ئاوێتەیەیە کە دەراز پێیگەیشتووە لەڕێی کۆکردنەوەی ئایەتە قورئانییەکانەوە، و خۆی درێژەی پێدەدات و دەڵێت:"گومانی تیا نیە ئێمە هەوڵ دەدەین ئاوێتەیەك بکەین لەم بوارەدا...و قورئان خۆیشی بنەمای ئەم ئاوێتەیەمان پێدەدات کاتێك ڕایدەگەیەنێت﴿إن الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم﴾ بۆیە کاتێك خۆی-مەبەستی قورئانە- بڕیار دەدات کە

**خودا دەسەڵاتی هەیە بەسەر ویستی مرۆڤدا ئەوە ئەستۆپاکیی ئێمە ناگەیەنێت لە بەرامبەر کردارەکانمان، چونکە خودا بە ڕەهایی ئەوە ناکات بەڵکو وەك ڕێکارێکی بەرامبەریی دەیکات، واتە وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ هەندێك شتی ئێمە...ئێمە کاتێك بڕیار دەدەین کە سەرجەم ئەم شوێنەوارانە بەهۆی هێزێکی باڵاو سەرو سروشتەوەیە ئەوا دەبینین بڕیارەکەمان لە ویستی خۆمانەوە سەرچاوەی گرتووە. کەواتە ئێمەین دەستپێکی کرانەوەمان کردووە بەرەو ڕوناکی، یاخود ڕومان وەرگێڕاوە لێی﴿و من یعش عن ذکر الرحمن نقیض له شیطانا فهو له قرین﴾. ئێمەین سەرەتا دەستمان کردووە بە ڕوناك کردنەوەی هزرمان یاخود بە کوژاندنەوەی﴿کلا بل ران علی قلوبهم ما کانوا یکسبون﴾. بڕیارمان داوەتە دەست ئارەزووەکانمان و شوێنی کەوتووین ﴿ لو شئنا لرفعناه بها و لکنه اخلد الی الأرض و اتبع هواه﴾".**

**پوختەی ئەم ئاوێتە کردنەی ئایەتەکانی دادگەریی و ئایاتەکانی توانایی لە قورئان دا بریتییە لەوەی لە بنەڕەتدا مرۆڤ ئازادە لە بەرامبەر هەر بڕیارێك بۆ خۆیی دەدات، و هیچ واتایەك نیە بۆ بەرپرسیاریەتی ڕەوشتیی بەبێ بوونی ئازادی، بەڵام ئەندازەگیریی خودایی دەستوەر دەداتە ژیانی مرۆڤەوە بۆ چەسپاندن و جێگیر کردنی کەسێك ڕاستیی و دادگەریی**

هەڵبژێرێت، و بۆ پشت تێکردنی کەسێك کە ڕێبازی گومڕایی و ستەم هەڵبژێرێت. ئەندازەگیریی بەم واتایە بریتییە لە ئەنجام وەرگرتنێکی دونیایی زوو. لەو ئایەتانەی قورئانیش کە بەڵگەن بۆ ئەم واتایە-لەگەڵ ئەوانەی دەراز هێناونی لە سەرەوە-خودا دەفەرموێت:﴿و يزيد الله الذين اهتدوا هدى﴾، ﴿و نذرهم في طغيانهم يعمهون﴾ و ئایەتانی لەم واتایە زۆرن.

ئەگەر بە شێوەی تیۆری گونجاو بێت دروست کردنی مرۆڤ لە حاڵەتی جەبردا لەلایەن خوداوە، وەك ئەوەی بەدیهێنراوانیتری زۆری دروست کردووە لە حاڵەتی جەبردان، ئەوا بە شێوازی کرداری مرۆڤ لە حاڵەتی جەبردا نیە، بەڵکو ئازاد و دەستکراوە و بەرپرسیارە لە کردارەکانی، بۆیە دەبێت ئایەتەکانی جەبر و توانایی واتای تیۆریی مەرجداریان بدرێتێ، و ئایەتەکانی دادگەریی و ئازادییش واتای کرداریی بەدیهاتوو، لە ژیان دا. بەمەش سازان دروست دەبێت و گرفتەکەش نامێنێت.

شوێنکەوتن و داهێنان (السنة و البدعة)

لە میهری خوداوەیە بۆ مرۆڤایەتیی کە کۆتا پەیامی دەورە داوە بە ئامرازەکانی پاراستنی پاکیی و بێ لەکەیی، تا وەك بەڵگەی خودا بمێنێتەوە لەسەر بەندەکانی بۆ هەتا هەتایی. یەکێك لە ئامرازەکانی پاراستنی پەیامی ئیسلامیی ئەو جیاکارییە ئاشکرایەیە لەنێوان شوێنکەوتن و داهێنان لە

ڕۆشنبیریی ئیسلامیی دا، ئەمەیش بابەتێکە کە زانایانی موسوڵمان هەوڵی زۆریان لەگەڵ داوە بۆ دەرخستنی. لەکاتێکدا مێژووی ئاینە ئاسمانییەکانی پێشو بەڵگەیە لەسەر تێکەڵییەکی خراپی نێوان پەیامە بنەڕەتییەکە و بابەتە داهێنراوەکان بە دەستی ئایندارەکان، بەجۆرێك روح و ناوەرۆکی بنەڕەتیی پەیامە خوداییەکە ون بووە لەناو تۆز و خۆڵی داهێنان و لاسایی کردنەوە.

شوێنکەوتن (السنة) لە ڕۆشنبیریی ئیسلامیی دا چەمکێکی فرە مانایە، چوون لە زانستی فەرمودەناسییدا هاوواتای "فەرمودە"یە واتە کردار و گوفتار و دانپێدانانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)، لە فیقهدا واتای فەرمانێکی شەرعییە کە پابەندکەر نیە، لە بیروباوەڕیشدا واتە مەنهەجێکی دروست لە باوەڕ و کردار دا. یەکێك لەو خاڵانەی زۆرێك لە خوێنگەرمانی مەنهەجی سوننی-کە پابەند نابن بە میانڕەوی لێبوردە- ئەمڕۆ لێی بێئاگان، ئەوەیە کە پێویستیی کۆبونەوە کەمتر نیە لە بەهای پێویستیی شوێنکەوتن، و مەزهەبگەرایی و پەرت کردنی یەکڕیزیی داهێنراوێکی نەخوازراوە، بۆیە زانایانی ئیسلام بەدرێژایی سەدەکانی پێشوو ڕێبازی دروستیان ناوناوە "ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە". لە فەرمودەدا هاتووە:"وازهێنان لە جەماعەت، وازهێنانە لە سوننەت". ئەگەر موسوڵمانان ئەم

فەرمودەیەیان لەبەرچاو بگرتایە ئەوا ئەو هەموو لافاوی دەمارگیری و مەزهەبگەراییە بێ فەرەیان توش نەدەبوو.

جا جیاکارییش لەنێوان شوێنکەوتن و داهێنان ئاسان نیە، و زانایان بۆچونی جیاوازیان هەیە لەسەری، لەنێوان سۆفییەکی فراوانکار کە هیچ کارێك بە داهێنراو دانانێت مادام بکەوێتە چوارچێوەی مەبەستە گشتییەکانی شەریعەت ئەگەر چی هێلەکانیشی داهێنراو بن، و تەسك بینێکی سەلەفی کە شوێنکەوتن تەنها لە شێوازە مێژوویە کۆنەکەیدا دەبینێت. بەشداریی شێخ دەراز لێرەدا ناوازەیە، بەجۆرێك کە پێنوسەکەی خستۆتەگەڕ بۆ دەرخستنی ئەم واتایانە لە کتێبی "الميزان بين السنة و البدعة"، و ئەویش درێژکراوەی کتێبێکی کۆنە کە پێشەوا (الشاطبي) نوسیویەتی، کە بریتییە لە "كتاب الاعتصام" و دەراز زۆر بە قوڵیی کاریگەر بوو پێی، و هەر وەك کاریگەر بوو بە کتێبەکەی تری الشاطبي "الموافقات".

دەراز لە ئاسۆیەکی فراوانەوە ڕوانیویەتییە دوانەیی شوێنکەوتن و داهێنان، بۆیە هەردوو چەمکەکەی خۆستووەتە چێوەی کاتەوە، و ئاشکرای دەکات کە شوێنکەوتن و داهێنان لە بەرکارهێنانی جیلی یەکەمی موسوڵمانان تەواو نزیکە لە هاوواتای چەمکی ڕاستیی و پوچ (الحق و الباطل)،"چوون وشەی (السنة) لە ڕاستییدا کە بەکارهێنراوە بۆ ڕێبازە ئاینییەکان، لای

جیلی یەکەم، مەبەست لێی ئەوە بووە کە ڕاست بووە و ئامانجی پێکاوە، ئەویش ئەو ڕێگەیەیە کە قورئان و ڕوونکردنەوەکانی[1] پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر)بۆی کێشاوین، چ بە دەق یاخود بە هەڵێنجان. هەر وەك وشەی (البدعة) لە ڕاستییدا بۆ ئەو بابەتانە بەکار هاتووە کە پوچ و گومڕاییە، ئەویش ئەو ڕێبازە داهێنراوانەیە کە پاڵپشتیان نیە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)، و لەوانەشی کە لێیان هەڵێنجراون بە شێوازە گونجاوەکانی هەڵێنجان. بۆیە بەخراپ ناوزەد کراوە بە شێواز و دەربڕینی گشتگیر و گشتی :"و إیاکم و محدثات الامور، فإن کل محدثة بدعة، و کل بدعة ضلالة".

پاشان دەراز شوێن پەرەسەندنی هەردوو چەمکەکە دەکەوێت لە دوای سەردەمی پێغەمبەر و یارانی، و دەڵێت:"هەرچی زانایانی موسوڵمانن لە دوای جیلی یەکەم، ئەوا دوو کۆمەڵەن: کۆمەڵێکیان ئەوانەن کە بەکارهێنانە شەرعییەکەی ئەم دوو چەمکەیان وەك خۆی هێشتۆتەوە و زیاد و کەمیان نەکردووە. و کۆمەڵەکەیتریش

---

[1] لەگەڵ تەواوی ڕێزم بۆ نوسەر کە دەستەواژەی ڕوونکردنەوەی بەکارهێناوە بۆ فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خودا، بەڵام بە هەڵەی دەزانم چوون قورئان ناڕوون نیە تا پێویستی بە ڕوون کردنەوە هەبێت، و وشەی تبین لە فەرمایشتی (لتبین للناس ما نزل الیهم) هەر لە قورئاندا واتاکەی هاتووە کە بریتییە لە ئاشکرا کردن و نەشاردنەوە-وەرگێڕ-

له دیاریی کردنی واتای شوێنکەوتن ڕێبازێکی سێیەمیان هێنایە کایە، و بۆ واتای چەمکی داهێنانیش فراوانییەکیان کرد کە نزیکە لە واتای زمانەوانی چەمکەکە. جا شوێنکەوتن لای ئەوانە بریتیی بووە لەو ڕێبازە ئاینییەی، بە هەمان شێواز و چۆنیەتی، کاری پێکراوە لە سەردەمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)، و داهێنانیش هەموو ئەو شتە نوێیانە دەگرێتەوە کە خودی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) نەیکردووە، و پێشتر بەو شێواز و چۆنیەتییە نەبووە لەسەردەمی پێغەمبەرایەتی، جا کاری پێکرابێت لەسەردەمی یاران یاخود کاری پێنەکرابێت تا دوای وان، جا بەڵگەی دروستیشی هەبێت لە فەرمودەی ڕاست یاخود نەیبێت".

دوای ئەم پێشخانە تیۆرییەی دەراز سەبارەت بە پەرەسەندنی چەمکەکان، دەراز ئاشکرای دەکات کە مەرج نیە هەموو داهێنانەکان-بە واتای دەستەواژەیی تەسك- گومڕاییەکی سەرکۆنەکراو بن. ڕاجیایی زانایانیش لەم بابەتەدا دەگەڕێتەوە بۆ"ڕاجیایی لەسەر ئەو دوو چەمکەی باس کران" لە ناساندنی شوێنکەوتن و داهێنان. بەڵام دەستەواژەی باوی سەرەتای ئیسلام کە فەرمودە پشتگیریی دەکات بەوەی هەموو داهێنانێك گومڕاییە، "ئەوا هیچ موسوڵمانێکی ئاسایی، چ جای پێشەوایەك لە پێشەوایانی موسوڵمانان، ناتوانێت جیاکاریی بکات لەنێوان باش و

خراپی-مەبەستی داهێنانە-... لێرەدا پێشەوا مالك دەفەرموێت: (هەرکەس شتێك دابهێنێت لە ئیسلام دا و بە باشی بزانێت ئەوا بانگەشەی کردووە کە گوایە محمد (درودی خودای لەسەر) ناپاکی کردووە لەگەڵ پەیامەکەی، چوون خودا دەفەرموێت:﴿اليوم اكملت لكم دينكم﴾ بۆیە ئەوەی ئەو کاتە ئاین نەبوبێت ئێستاش ئاین نیە)".

دەربارەی دەستەواژەی شوێنکەوتن و داهێنانیش کە دەستکاری کردن ڕووی تێکردوون جا بە تەسك کردنەوە یاخود فراوان کردن، لە دوای سەرەتای ئیسلامەوە، ئەوا هەموو داهێنراوێك خراپ نیە لە ڕووی شەرعەوە، وەك دەراز دەڵێت. لەم ڕوانگەیەوەیە"داهێنراوەکان دەبنە دوو بەشەوە کە باش و خراپن: هەرچییەك بەڵگەی شەرعی لە پشتەوە نەبوو ئەوا خراپە لە ڕووی شەرعەوە، ئەگەر چی خاوەنەکەیشی بیەوێت بە گومان و تەئویل پشتگیری بۆ پەیدا بکات، و هەرچیش بەڵگەی هەبوو جا لە قورئان یاخود فەرمودە یاخود کۆڕایی زانایان یاخود بەراوردکاریی یاخود جگە لەم بەڵگانەی وەك ئەوەی قورئان و فەرمودە ئاماژەیان پێداوە، ئەوا باشە، ئەگەر بەو شێوازەش بوونی نەبوبێت لەسەردەمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)".

ئەم وردەکارییەش باس کراوە لەلایەن هەندێك لە زانایانی پێشین، لەوانەش پێشەوا شافیعی کە لێی دەگێڕنەوە:"داهێنراوان

دوو بەشن: ئەو داهێنراوەی ناكۆكە لەگەڵ قورئان یاخود فەرمودە یاخود ئەسەر یاخود كۆڕایی، ئەوە داهێنراوێكی گومڕاییە. هەرچی داهێنراوی چاكەیشە كە ناكۆك نیە لەگەڵ ئەوانەدا ئەوا داهێنراوێكی باشە". لە گێڕانەوەیەكیتر لێیەوە:"داهێنراو دوو جۆرە: داهێنراوێكی ستایشكراو و داهێنراوێكی سەركۆنەكراو. هەرچی كۆك بوو لەگەڵ فەرمودە ئەوە ستایشكراوە، و ئەوەشی ناكۆك بوو ئەوە سەركۆنە كراوە".

ژمارەیەك لە زانایان شوێن شافیعی كەوتوون لەم جیاكاریی دەستەواژەییەدا و فراوانتریان كردووە، لەوانەش (عزالدین كوڕی عبدالسلام) و (شهاب الدین القرافی)، بەجۆرێك ئەوان داهێنراویان دابەش كردووە بۆ پێنج بەش: پێویست وەك كۆكردنەوەی موسحەف، سوننەت وەك نوێژی تەراویح، موباح وەك هەبوونی خواردنی جۆراوجۆر، نەخوازراو وەك ڕازاندنەوەی مزگەوتەكان، و قەدەغە وەك گۆشەگیریی.

دەراز پێی وایە كە ڕاجیایی لەنێوان قوتابخانەی فراوانكردن و قوتابخانەی تەسك كردن سەبارەت بە داهێنراو، ڕاجیاییەكی ڕووكەشە، و "هۆكاری جیاوازییەكەش بابەتی بڕیار لەسەر دراوە، چوون ئەو واتایەی كە بەشی یەكەم بڕیاری سەركۆنەكردنی ڕەهای بەسەردا دەدەن ئەوە بەشی دووەم هیچ درێژەیەكیان نەداوە بە باس كردنی، بۆ نمونە هیچ كەسێكیان بە بابەتێكی

نەوتووە چاکە کە هیچ بەڵگە و بیانوویەکی شەرعی پشتگیری نەکردبێت. هەروەك ئەو واتایەی ئەم بەشە بەدرێژیی باسی لێوە دەکەن ئەوا پێشین سەرکۆنەیان نەکردووە بە ڕەهایی، بۆ نمونە کەسیان نەیان وتووە هەر شتێك وەك ئەوەی کە هەیە، لەسەردەمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)دا بەو شێوەیە نەبووبێت ئەوا سەرکۆنەکراوە ئەگەر چی بەڵگەی لەسەر بێت و یارانیش کۆڕا بووبن لەسەری، بەڵکو ڕاجیا بوون لەسەر ناونانی ئەم کردارە بە سونەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)، بۆیە ناویان ناوە داهێنراوێکی بەباش زانراو، یاخود سوننەتی یاران. لەکاتێکدا دەستەی دەستەواژەی یەکەم دەیانەوێت ناوی بنێن بە ﴿سوننەتی﴾ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)، چونکە گرنگ یەکێتی ڕێبازی حوکمەکەیە ئەگەرچی شێوازەکەیشیان جودا بێت".

دەراز لەگەڵ ئەو هێرش کردنەی (الشاطبي) دا نیە بۆ سەر (القرافي) بەهۆی ئەوەی وەك مامۆستاکەی، عز کوڕی عبدالسلام، داهێنراوی کردووەتە پێنج بەش، بێ ئەوەی تەحقیقی لێبکات. دەراز بەرگری لە القرافي دەکات، و ئاشکرای دەکات کە ڕاجیایی لێرەدا هیچ بیانویەکی نیە"چونکە بابەتەکە-وەك زانرا-بابەتێکی دەستەواژەییە و هێرش کردنە سەر ئەوانیتر باش نیە مادام

بڕیارەکە لەنێو زانایاندا کۆڕا بن لەسەری. ئەوانیش﴿القرافی و ماموستاکەی﴾ لێرەدا پێشینیان هەیە کە پێشەوا شافیعییە".

دەراز پێی وا نیە کە هەرچی جیاواز بوو لە شەرع ئەوا داهێنراو بێت"بەڵکو ئەم جیاواز بوونە لە خەڵك بکرێتە ئاین ئەوە داهێنانە"، و درێژەی پێدەدات و دەڵێت:"هەرکەس زۆر هەوڵ بدات لەگەڵ سەرپێچییەك تا ڕەنگ و بەرگی ئاینی بکات بە بەردا و بیخاتە سنورەکانی شەریعەتەوە ئەوە داهێنانی ئەنجام داوە. هەروەك کەسێکیش کارێکی کرد بووە هۆی گۆڕینی بارە شەرعییەکان ئەوە داهێنەرە ئەگەر چی کردارەکە لە بنەڕەتدا قەدەغە و نەخوازراویش نەبێت، وەك ئەوەی بیەوێت کارێکی موباح گەورە بکات و بیکاتە هۆکاری نزیك بوونەوە لە خودا، یاخود بیەوێت سوننەتێك بکاتە پێویست، یاخود کارێکی ڕێگەپێدراو بخاتە شوێن و شێوازێکەوە گوایە ڕێگە پێنەدراوە".

لەنێوان داهێنراو و سەرپێچی دا گشتگیریی و تایبەتکردنێکی ڕەهایی هەیە-وەك زانایانی اصول دەڵێن-بۆیە هەموو داهێنراوێك سەرپێچییە بەڵام هەموو سەرپێچییەك داهێنراو نیە. دەراز جیاوازی نێوان ئەم دوو چەمکە ئاشکرا دەکات و دەڵێت:"ئەو کەسەی سەرپێچی دەکات بەهۆی تووڕەیی یاخود زاڵ بوونی ئارەزووەوە، و بە حەڵاڵی نازانێت، ئەوە کەسێکی سەرپێچی کارە بەڵام داهێنەر نیە، ئەگەر چی سەرپێچی و نەخوازراوەکانیش بڵاو

ببنەوە لەناو خەڵكیدا و ببنە عادەت، لەم بارەدا ناوی داهێنراو وەرناگرێت تەنها لەبەر ئەوەی بڵاو بۆتەوە، مەگەر لە بارێكدا بێت كە خەڵكی پێیان وابێت دروستە یاخود بەرەو ئەوە بڕۆن بە دروستی بزانن، بەجۆرێك كەسانێك ئەنجامی بدەن كە جێی متمانە و شوێنكەوتنی خەڵكی بن لە ئایندا، یاخود ئەم كەسانە بێدەنگ بن لە نكوڵی كردن لێی لە كاتێكدا بتوانن نكوڵیشی لێبكەن، و بەم هۆیەوە نەزانەكان وا بزانن دروست و ڕێگەپێدراوە، و تازە موسوڵمان بووەكان و ئەو كەسانەی منداڵن لەسەر ئەوە گەورە ببن پێیان وا بێت دروست و ڕێگە پێدراوە، لەو بارەدا پێی دەوترێت داهێنراو و بڕیاری داهێنراوی بەسەردا دەچەسپێنرێت".

دەراز پێی وایە شەرعی ئیسلامیی بەهۆی گشتگیریی و فراوانییەوە، ڕێنمایی پێویست فەراهەم دەهێنێت بۆ مرۆڤ لە سەرجەم بوارەكانی ژیان، و سنورانێكی داناوە كە مرۆڤ لەنێویدا ژیانێكی شایستە بژی. جا بۆ گونجاو بون لەگەڵ گشتگیریی شەریعەت، دەبێت تێگەیشتنێكی گشتگیریش وەربگرین بۆ داهێنراو. بۆیە داهێنراو كورت هەڵنایەت لە بواری پەرستشە دروشمەكان بە تەنها، بەڵكو بواری مامەڵە و كرداری ڕۆژانەش دەگرێتەوە، چوون پەرستن و مامەڵە-كردار-یش دوو دیوی هەمان شەرعن، و شەرعیش سنوری بۆ هەر یەكێكیان داناوە، و "هەر

گۆڕانکارییەك ڕوبدات لەم بەشەیان یان لەو بەشەیان ئەوا لە ڕاستییدا دەچێتە خانەی داهێنان لە ئاین، هەر کات سەلمێنرا کە گۆڕینی ئەو سنورانەیە".

دەراز لەم بوارەدا شوێن پێی پێشەوا (الشاطبي) هەلگرتووە کە فراوانییە لە پێناسەی داهێنان و جەخت دەکاتەوە: "ئەگەر داهێنان لە پەرستشەکاندا ڕێی تێ بچێت، ئەوا لە مامەڵەشدا ڕێی تێدەچێت، چونکە جیاوازی نییە لەنێوانیاندا. لەبەر ئەوەی کارە ڕێپێدراوەکان بەگوێرەی شەرع، هەندێك جار پەرستشن، هەندێك جاریش ئاسایین. هەردوکیان ڕێپێدراون لەلایەن یاسادانەرەوە. جا مادام داهێنان لە یەکێکیان ڕوو دەدات ئەوا لەوی دیش ڕوودەدات". لێرەدا (الشاطبي) نمونەیەك دێنێتەوە کە داهێنانی"دانانی بڕێك پارەیە لەسەر خەڵکی وەك کارێکی بەردەوام و هەمیشەیی لێبێت، یاخود لە کاتێکی دیاریی کراو و بە چۆنیەتییەکی دیاری کراو، بەجۆرێك وەك یاسای خودای لێبێت، هاوشێوەی زەکات".

بەڵام دەراز خۆی دەپارێزێت لە ناوزەد کردنی یاسا دانراوەکان بە داهێنراو مەگەر لە کاتێکدا بێت"خەڵکی گومانی وای لێبکەن کە یاسایەکی ئاسمانییە". بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت ئەوا پێی وایە یاسا دانراوەکان"سەرپێچییەکی دیاری گەورەن". هەرچۆنێك بێت، ئەوا دەراز کۆك نیە لەگەڵ ئەوانەی لەمرۆدا

چەمکی داهێنان کورت دەکەنەوە لەسەر بیروباوەڕ و دروشمەکان، بەڵکو ئەو لەوە فراوانتری دەبینێت، بۆیە دەبێت داهێنانی بواری سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابوورییش ڕەگەڵ ئەم چەمکە بخەین.

بەم چەشنە دەبینین دەراز ڕێڕەوێکی میانڕەو دەگرێتەبەر، بۆ دەستنیشان کردنی دەردی داهێنان، چوون لەگەڵ تەسك کردنەوەی سەلەفییەکان نیە کە هەموو تازەیەك بە داهێنراوێکی سەرکۆنە کراو دەزانن، و لەگەڵ فراوان کردنی سۆفییەکانیش نیە کە داهێنراو سادەیە لایان. بەڵکو ئەو پێی وایە بابەتەکە پێویستی بە لەسەر وەستانێکی وردتر و جیاکارییەکی ڕوونترە لەنێو چەمکە شەرعییەکان و دەستەواژە مێژووییەکان.

## ئاشتی و جەنگ

قسە و باس لەسەر بابەتی جەنگ و ئاشتی لە ئیسلام دا زۆر بوو لەمساڵانەی دوایی، بەهۆی ئەو بەرز و نزمییانەی بەسەر باری ئوممەتی ئیسلامیدا هات، و ڕوداوی خوێناویی، و ناڵاندنی لەژێر چەپۆکی هەندێك لە دەسەڵاتدارەکانی، و داگیرکردنی بەشێك لە وڵاتانی لەلایەن دەوڵاتانی ترەوە، و ون بوونی دەنگە زانستییە هاوسەنگەکان لەنێو ژاوەژاوی چەلەحانێی بانگەشەکاریی. ئەمە ساتێکی گرنگە بۆ زانینی ئەو بەشدارییە ناوازەیەی دەراز کردی، و ناساندنی بۆچونەکەی کە خاوەنی

ڕەسەنایەتیی و قوڵیی، و میانڕەوییەکی پاکە، نە زیادەڕەویی تێدایە و نە بەزایەدان.

دەراز باسی مەنهەجی ئیسلام دەکات لە پەیوەندیی نێوان شوێنکەوتووانی ئاینزا جوداکان، و تێڕوانینی ئیسلامییانە بۆ بابەتی ئاشتی و جەنگ لە وانەیەکی بۆ (کۆنگرەی ئاینەکانی جیهان) کە لە فەرەنسا بەسترا ساڵی ١٩٣٩. هەروەك کۆڵینەوەیەکی قوڵیشی نوسی بە زمانی فەرەنسی بە ناونیشانی: (پرنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتیی لە ئیسلام دا) و لە گۆڤاری (المجلة المصرية للقانون الدولي)بڵاوی کردەوە و دواتر کردیە عەرەبی و لە گۆڤاری ئەزهەر بڵاوی کردەوە ساڵی ١٩٥٢. چەند بەرکەوتنێکی قوڵیشی کردووە لەگەڵ بابەتەکە لە کتێبی "مدخل الى القران الكريم" و هەندێك کتێب و ستونی دیکەشی.

دەراز بابەتەکەی کردووەتە دوو بەش: تیۆری و کردارییی، و ئاشکرای دەکات؛ بنەمای تیۆریی بابەتەکە لە ئیسلام دا لەسەر چوار پایە دادەمەزرێت، بریتیین لە:

یەکەم: ئیسلام جەخت دەکاتەوە لەسەر نزیکیی رۆحیی لەنێو ئاینزا جوداکان، و داوا دەکات"لە شوێنکەوتووانی ئاینزاکانی پێشوو بۆ پێکهێنانی خانەوادەیەکی روحیی، باوەڕی بە سەرجەم کتێبەکان و پێغەمبەران هەبێت بێ جیاوازی کردن لەنێوان هیچ کامیان".

**دووەم: جەخت کردنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)"کە هیچ شتێکی تازەی نەهێناوە کۆنەکان بروخێنێت، بەڵکو هاتووە بۆ تازە کردنەوەی ئەوەی تۆزی لەسەر نیشتووە، ئاشکرا کردنی ئەوەی شاراوەتەوە، ڕاستکردنەوەی ئەوەی بە لاڕێدا براوە". لەم بابەتەش دڵنیا دەبین کاتێك دەبینین زۆرجار دەربڕینی "ئیسلام" لە قورئان دا هاتووە بە"واتای هاوبەشی نێوان ئاینزا ئاسمانییەکان".**

**سێیەم: ڕێگەنەدان بە زۆرەملێ کردن لە ئاین دا، ئەمەش ڕێسایەکە"کاری پێغەمبەری دیاری کردووە کە بریتی نیە لە زۆر کردن لە خەڵکی بۆ باوەڕ هێنان، بەڵکو فێرکردن و ئاگادار کردنەوەیە، پاشان لێگەڕانی بابەتی بیروباوەڕیان بۆ خودای گەورە؛ خۆی بڕیاری لەسەر بدات لەنێو مرۆڤەکان".**

**چوارەم: دانان بە مافی ڕاجیایی لەم ژیانی دنیایەدا، و دواخستنی بڕیاری کۆتایی لەم ڕاجیاییە بۆ ڕۆژی پاداشت و سزا، و قایل بوون بەوەی جیاوازیی مرۆڤەکان لە ئاینیان، داکەوتێکە دەمێنێتەوە تا مرۆڤ بمێنێت، سەرەڕای پێویستیی گەیاندن و هیوا هەبوون بە ڕێنمونی وەرگرتن کە دەبێت هەموو موسوڵمانێك لە خەمیدا بێت.**

**لەسەر بنەمای تۆکمەی ئەم چوار پایەیە، مەنهەجی کرداریی ئیسلام هاتووە دەربارەی ئاشتی و جەنگ بە دیدگایەکی ڕوون،**

**دەراز پوختی دەكاتەوە لە چوار خاڵدا، پاشان ڕێكیان دەخات بە پلەبەندیی بەرەوژوور، لە هەوڵدان بۆ خۆپاراستن لە جەنگ، بۆ مامەڵە كردن لەگەڵ شوێنەوارە قێزەونەكانی لە كۆتایی دا. ئەو دیدگایەش بریتییە لە:**

**یەك: دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەی ئاینیان جیاوازە لەسەر هەردو بنەمای چاكە و دادگەریی، و ڕێگریی لە دەستدرێژیی كردنە سەریان، یاخود جیاوازی بیروباوەڕ كردنە بیانوو بۆ جەنگ و دژایەتیی.**

**دوو: هەوڵدانی تەواو بۆ خۆپاراستن لە جەنگ هەرچەند دژایەتیی و كینە لە بەرامبەرەوە زەق بوو بۆ موسوڵمانان، و هاندانی موسوڵمانان بۆ وەرگرتنی دەستپێشخەریی ئاشتی، ئەگەر چی شتانێكی وەك ناڕاستگۆیی و فرتوفێڵیش لەپشتی ئەو دەستپێشخەرییەوە بن؛ بۆیە ئەم دوو ئایەتەش بەدوای یەكدا بەو واتایە هاتوون، ئەوانیش: ﴿و ان جنحوا للسلم فاجنح لها﴾ (الانفال: ٦١) ﴿و ان یریدوا ان یخدعوك فان حسبك اللّه﴾ (الانفال: ٦٢)**

**سێ: دانانی پێوەری ڕەوشتیی بۆ كەم كردنەوەی ناڕەحەتییەكانی جەنگ ئەگەر ڕویدا، و خۆپاراستن لە كەسانێك كە جەنگاوەر نین"فنهی عن قتل المرأة في بیتها، و الراهب في متعبده، و الفلاح في مزرعته...و في المیدان نفسه نهی عن التشفي**

بالتمثيل و التعذيب" واتە پێغەمبەر نەهی کردووە لە کوشتنی ئافرەت لە ماڵی خۆی دا، و کەسانی خواپەرست لە پەرستگاکەیان دا، و جوتیار لە کێڵگەکەی دا...و لە مەیدانی جەنگیشدا نەهی کردووە لە تێکدانی جەستەی کوژراو و ئەشکەنجەدان کە بکوژەکە بۆ ئۆخژنی و ئارامی بۆ هاتن بیکات.

چوار: لەگەڵ نیشتنەوەی تەپوتۆزی جەنگ و ڕاگرتنی دەستدرێژیکار پێویستە"الكرم و الصفح عن الماضي و عدم الاستمرار في تتبع الفارين الذين يطلبون الأمان، و يلقون كلمة السلام"واتە: بەخشندەیی و سینەفراوانیی بێتە ئاراوە بەرامبەر بە ڕابردوو، و شوێن نەکەوتنی هەڵاتوانێك کە داوای ئەمان دەکەن، و سڵاوی ئاشتی دەکەن، هاوشێوەی ئەوەی پێغەمبەری خودا کردی لە کاتی ڕزگارکردنی مەککە.

دەراز ئامۆژگاریی پیاوانی ئاینیی سەرجەم ئاینزاکان دەکات بۆ کارکردن لەپێناو کەم کردنەوەی ئازارەکانی مرۆڤایەتیی، ئەویش بەوەی"يعنى كل رجل دين عناية خاصة بالجانب الخلقي العام منه، فينموا في اتباعهم عاطفة الأخوة الانسانية باسم الدين نفسه" واتە: هەموو پیاوانی ئاینی گرنگییەکی تایبەت بدەن بە لایەنی ئاکاریی گشتیی، تا لەنێو شوێنکەواتووانیاندا سۆزی برایەتی مرۆڤایەتی بچێنن بەناوی خودی ئاین خۆیەوە. جا ئەم وەسیەتە چەند گرنگ و بەبەهایە، لە کاتێکدا کە گرنگی دان بە

بواری بیروباوەڕ لەناو ئایندا زاڵ بووە لەسەر حسابی بوارە ئاکاریی و جوانیی و مرۆییەکان، و زەق کردنەوەی هۆکارەکانی ڕاجیایی لەنێو ئاینزاکان لەسەر حسابی هۆکارەکانی نزیك بوونەوە و بەیەك گەیشتن.

دەراز بیری نەچووە باسی سروشتی فتوحاتی ئیسلامییش بکات، لەگەڵ شوێنەوارە مێژووییەکەی، پاشان پەیوەندی ئەوانە بە ڕێنماییەکانی ئیسلام لە کاتی ئاشتی و جەنگ. دەراز بەشی سێیەمی کتێبی "مدخل الی القران الکریم"ی تایبەت کردووە بەم بابەتە. دەستپێکەکەیشی بە باسی سروشتی ناوازەی فتوحاتی ئیسلامی بووە، نەك تەنها لەبەر خێراییەکەی کە تا ئێستاش میژوونوسانی سەرسام کردووە، بەڵکو لەبەر شوێنەوارەکەیشی کە تا ئەمرۆ ماوەتەوە، ئەوەش شوێنەوارێکە ژیانی گەلانێکی گۆڕیوە لە ڕووی تێروانینیان بۆ گەردون و مرۆڤ، و زانست و هونەرەکانیشیان مۆرکێکی ئیسلامی بەبەردا کراوە.

دەراز پێی وایە هەندێك لە مێژوونوسان هەڵە دەکەن لە بەراوردکردنی فتوحاتی ئیسلامی بە فتوحاتی سەردەمی ئەسکەندەری مەقدۆنی لە سەردەمی یۆنانیی دا، چوون ئەمان لەبیریان چووە؛ فتوحاتی ئەسکەندەر ئەو شوێنەوارە گەورەیەی جێنەهێشتووە لەسەر ئەو گەلانەی غەزوی کردوون، و کاریگەر نەبوون بە کلتور و ڕۆشنبیریی یۆنانی کە ئەسکەندەر

هەڵیگرتبوو لەگەڵ خۆی لە کاتی هێرشەکانیدا، تەنیا دەستەبژێرێکی کەم نەبێت لە چینی خۆشگوزەرانەکانی ناو شار. بەڵکو کاریگەر بوونی جەنگاوەرە یۆنانییەکان بەو گەلانەی غەزویان کردن زیاتر بوو لە پێچەوانەکەی بەجۆرێك دەکرێت بڵێین:"ڕۆژهەڵات توانیان غەزوکارانیان بشکێنن"لە ڕۆژئاواییەکان، هەروەك دەراز دەڵێت.

بەڵام فتوحاتی ئیسلامی سەرجەم خوو و کلتور و ڕۆشنبیریی ئەو گەلانەی گۆڕی کە گەیشتە لایان، ئەمەش کورت هەڵنەهات لەسەر دامەزراوە ڕامیاری و ئابورییەکان، بەڵکو گۆڕانکارییەکە گەیشتە"روحی خەڵکی، و زمان، و هزر، و یاسا، و خواست، و ویست، و تێروانیان بۆ بەدیهێنەر و بەدیهێنراوەکانیشی". ئەم شوێنەوارە قوڵەی تا ئێستاش ماوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیسلام بە شمشێر بڵاو نەبۆتەوە وەك ڕۆژئاواییەکان بانگەشە دەکەن، بەڵکو دەرونەکان بە ویستی خۆیان وەریان گرتووە و ئاوێتەی دڵان بووە، و "غەزوی روحەکان"بووە بەڕاستی، بەپێی وتەی دەراز، ئەوەش سەرچاوەی هێزی ئیسلام و نهێنی نەمرییەتی.

دەراز ئاشکرای دەکات؛ ئیسلام خەسڵەتی میانڕەوی هەڵگرتووە لەنێو ئاین و ڕێبازە ڕەوشتییەکاندا لە هەڵوێستی دەربارەی بابەتی جەنگ و ئاشتی، بۆیە سەرکۆنەی ئەوانەی کردووە کە ڕێبازی ڕۆچون و خراپەکاریی و خوێنڕشتنی بەناحەقیان

**گرتووە، بەڵام قایلیش نیە بەوەی شوێنکەوتوانی لە ستەم بێدەنگ بن، یاخود پشت بکەنە بێدەسەڵاتان لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵانێك کە ناتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن ڕووبەڕوی ستەمکاریی و دەستدرێژیی. بەم چەشنە ئیسلام دەمارگیریی ئاینی کوێرانە ڕەد دەکاتەوە، هەروەك گوێپێنەدانی ساردوسڕانەش ڕەد دەکاتەوە.**

**سروشتی پێغەمبەری خودا وا بووە، تۆڵەی بۆ خۆی نەکردۆتەوە، بەڵکو ژیانی بەڵگەیە لەسەر سینەفراوانی و لێبوردەیی لەگەڵ تواناییشدا. لە وێنەی لێخۆش بوونی لەو پیاوە قورەیشییەی لە مەککەوە هاتبوو بۆ کوشتنی، و لەو ئافرەتە جووەی زەهری کردبووە خواردنەکەیەوە لە خەیبەر، و لەو پیاوەشی ئازاری زەینەبی کچی دابوو. پاشان سۆز و لێبوردەیی لە هەموو قورەیشییەکان لە ڕۆژی رزگارکردنی مەککە لە کاتێکدا ئەوان ئازاریان دەدا لە مەککە، و دژایەتییان دەکرد لە مەدینە بۆ ماوەی چەندین ساڵ. بەڵام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) یارانی فێری پیاوەتیی و جوامێریی دەکرد بەجۆرێك کە زۆر ئاسان بن بۆ سەرخستنی ستەملێکراو لە هەر شوێنێك بن.**

**دەراز بەڵگە دەهێنێتەوە لە کتێبی "مدخل الى القران الكريم" —کە کتێبێکە لە بنەڕەتدا بۆ خوێنەرانی زمانی فەرەنسی نوسراوە-بە وتەیەکی (گۆتییە)لە کتێبەکەی بەناوی (اخلاق**

المسلمين و اعرافهم) كه دەڵێت:"عەرەب هەرگیز هەوڵیان نەداوە- تەنانەت كاتێك لە لوتكەی جۆش و خرۆشی ئاینییان دابوون- بۆ كوژاندنەوەی بیروباوەڕی خەڵكانیتر بە خوێنڕشتن". لە ڕاستییدا بزاوتی فتوحاتی سەرەتا-ئەگەر لە چێوە مێژووییەكەیدا وەریبگرین و بڕوانینە بەرهەمەكانی- ئەوا بزاوتێكی ڕزگاركردنی گەورە بوو، بۆ گەلانێكی تینوی ئازادی لە ژێر نیری ستەمی بیروباوەڕیی و ڕامیاریی. ناڕەحەتی و قوربانییەكانی ئەو بزاوتە زۆر كەمتر بوو بەراورد بە بەرهەمەكانی، و خێراییەكەیشی هێندەی چاو تروكان بوو، بەجۆرێك مرۆڤ وا هەست دەكات"دەرگاكان نیمچە كراوە بوون، و ڕزگاركاران تەنها پاڵێكی كەمیان پێوە نا بۆ ئەوەی بە تەواوی بكرێتەوە" هەروەك دەراز دەڵێت.

ئەمە واتای ئەوە نیە بزاوتەكەی سەرەتا وەك خۆی مایەوە لە دواییدا، بەڵكو درمی گیانی ئیمپراتۆریی-ئەوەی جوڵەی موسوڵمانانی سەرەتا بۆ رزگار كردنی گەلان بوو لێی-كەوتە گیانی موسوڵمانان خۆشیان، و پاڵنەرەكان ڕوویان كردە ڕووگەیەكی تری جودا كە پەیوەندی ئەوتۆی نەبوو بە ئیسلامەوە. بەڵام ئەوەی لای دەراز گرنگە: بیانو هێنانەوە نیە بۆ مێژووی ئیسلامی، بەڵكو ئاشكرا كردنی پەیامی ئیسلامە.

**دەراز دەیزانی لوتکەی چڵەپۆپەی ئیسلام بریتییە لە جیهاد، بەڵام دەیشیزانی؛ جەنگ ڕەوشتی تایبەتی هەیە لە ئیسلامدا. ئەم ڕەوشتەیە جیهاد جیا دەکاتەوە لەوانیتر، و پاکێتیی ئاکاری و پەیامە مرۆییەکەی دەپارێزێت. بۆیە دەراز بنەماکانی ئەو ڕەوشتە ئاشکرا دەکات و بنەڕەتەکەشی بریتییە لە چاکە و دادگەریی، و سەرخەستنی ستەملێکراو.**

**دەراز بە پێنوسی و زمانی بەشداریی کرد لە جیهادی وڵات و ئومەتەکەی، و هانی هاوڵاتییەکانی دەدا لەڕێی دەنگی قاهیرەوە، بۆ جیهاد کردن دژی سەهیۆنییەکان و پشتگیرە نێودەوڵەتییەکانیان، و وتەکانی زۆر و زەوەندەن سەبارەت بە پێویستی یەکدەستی دژی دوژمنی دەستدرێژییکار، و دەست گرتنی ئەو هاوپەیمانێتییە ستەمکارەی پشتی، و ڕەوانبێژانە دەیپرسی:"ئەگەر ستەمکاران پشتگیریی یەکتر دەکەن، ئەی بۆ ستەملێکراوان پشتگیریی یەکتر ناکەن؟"**

# بەشی سێیەم

# بوارەکانی نوێگەریی لە هزری دەراز

دکتۆر محمد عبدالله دەراز دەستپێکی کتێبە گەورەکەی "دستور الاخلاق فی القران"ی کردووە بە پەندێکی زانای بەناوبانگی ئەزهەر شمس الدین البابلی (ساڵی ١٠٧٧ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە)کە دەڵێت:"کەسێك کتێب نانوسێت مەگەر لە یەکێك لەم حەوت بوارەدا نەبێت، و جگە لەم بوارانە مرۆڤ ناتوانێت کتێب بنوسێت: یاخود لە بوارێکدا دەنوسێت کە کەس پێش ئەم نەینوسیوە و ئەم بوارەکە دادەهێنێت، یاخود شتێك کەموکورتی هەیە و ئەم تەواوی دەکات، یاخود شتێکی داخراوە و ئەم ڕاڤەی دەکات، یاخود درێژە و کورتی دەکاتەوە بێ ئەوەی واتاکەی تێك بدات، یاخود شتێکی تێکەڵ و پێکەڵ هەیە و ئەم ڕێکی دەخات، یاخود نوسەرێك هەڵەیەکی هەیە و ئەم ئاشکرای دەکات، یاخود شتێکی پەرتە و ئەم کۆی دەکاتەوە".

مەبەستی البابلی لە نوسینی بە کەڵك و سودە، واتە زیاد کردن لە ڕووی چۆنیەتییەوە بۆ زانیارییە باوەکان، جا بە داهێنانی بیرۆکەی نوێ بێت، یاخود داهێنانی ڕێباز و شێوازی نوێ بۆ ڕامان لە هزری باو و تێگەیشتنی و تێپەڕاندنی. بەڵام دوبارە کردنەوە و لاسایی کردنەوە، پێیان ناوترێت نوسین، بۆیە وتی:" جگە لەم

بوارانە مرۆڤ ناتوانێت کتێب بنوسێت " چوون مەبەستی ئەوەیە؛ نابێت شتی وا بکرێت، لەبەر ئەوەی بەزایەدانی هەوڵ و کاتە.

دەراز ئەم وتەزایەی لە پێش چاوی داناوە کاتی نوسینی "دستور الاخلاق فی القران" و لێگەڕا-بە خۆبەکەمزانینی زانایانی ڕۆچووەوە- بۆ خوێنەری کتێبەکەی تا بڕیار بدات لەسەر بەدەمەوە چوونی نوسەر بۆ ئەو پەندەی البابلی دایڕشتوە، پاشان بە متمانەی زانایەکی متمانەبەخۆی و هەوڵەکەیەوە وتی:"دەست پێکردنمان بە دانانی ئەم کتێبە نوێیە سەبارەت بە قورئان لەخۆڕا نەبوو بۆ بەزایەدانی کاتمان، و ناڕەحەت کردنی خوێنەران، و قەرەباڵخ کردنی کتێبخانەکان. خۆ ئەگەر ئەم کارەمان شتێکی نوێی تێدا نەبوو بۆ جیهانی ڕۆژهەڵات یاخود ڕۆژئاوا، ئەوا تەنها کات کوشتن و بارگرانییە".

دەراز مافی خۆیەتی بە ئارامی بنوێت ئێستا لە بەهەشتی نەبڕاوەدا-بە ویستی خودا- چوون کارەکانی لەم کتێبە و کتێبەکانیتریشی کات کوشتن نەبوو، بەڵکو خستنە سەرێکی بە بەها بوو بۆ تێگەیشتنی قورئان، و سەلماندنی سەرچاوە ئاسمانییەکەی، و قوڵبوونەوە بەناو واتاکانی، هەروەك دامەزراندنی دوو زانستی نوێ بوو لە زانستەکانی قورئان، دەراز بناغەکانی دانان، و چێوەکەی کێشان.

وا دیارە دەرازی کوڕ ئەم ڕێبازە نوێخوازییەی لە دەرازی باوکەوە بۆ ماوەتەوە، لەگەڵ توانای جیاکاریی لەنێوان بیرۆکەی بەبەها و بێ بەها، ڕێگەنەدان بە دوبارە کردنەوە و ڕەگەڵ کەوتن. ئێمە ئەو ڕێبازە لای دەرازی باوك هەست پێدەکەین لە نوسینی پێشەکی ئەو شەرحەی بۆ کتێبی (الموافقات)ی (الشاطبي) کردووە. لەوێ دەپرسێت دەربارەی هۆکاری بەناوبانگ نەبوونی کتێبی (الموافقات) لەگەڵ گەورە و گرانی بەهای کتێبەکە لە بواری خۆیدا. ئەو وەڵامەش ڕەد دەکاتەوە کە پێی وایە بەناوبانگیی کتێبەکانیتر بەڵگەیە لەسەر بەبەهاییان، و دەڵێت:"زۆری بەبەها هەن شاراوەن، و زۆری بێ بەهاش دیارن". نمونەی کتێبی (جمع الجوامع) بەسە بۆ کەسێك بیەوێت تێبگات، کە بەناوبانگ بوو لەناو کتێبەکانی اصول چەند سەدەیەك، و زۆرترین کەس دەیخوێندەوە لەگەڵ ئەوەی"کەمترین زانستی تیایە، و زۆرترین ماندوو بوونی دەوێت".

بینیمان کتێبی "دستور الاخلاق في القران" کاری سەرەکی دکتۆر دەرازە، و خستنە سەرێکی گەورەیە بۆ هزری ئیسلامی، کەچی هێشتا وەك پێویست گرنگی پێنەدراوە. لەم کتێبە و کتێبی"النبأ العظیم" و "مدخل الی القران الکریم" و "الدین"، لێوەشاوەیی دەراز دەردەکەوێت لە نوێکردنەوەدا، و کارامەیی لە زانستەکانی قورئان و ئاینەکان.

لەڕاستییدا هیچ یەکێك لە نوسینە هزرییەکانی دەراز خاڵی نیە لە تێڕوانینی نوێکردنەوەییانە، بناغە لەسەر تێگەیشتنی قوڵی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی و ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوایی لە هەمان کاتدا. بەڵام نوێکردنەوەکانی دەراز لە کۆڵینەوە قورئانییەکان دا زیاتر دەردەکەوێت. لەم بوارەدا زیادەڕەوی نییە ئەگەر بڵێین دەراز بناغەی دوو زانستی نوێی دانا، ئەوانیش زانستی"ڕەوشتی قورئان" و زانستی"سەرچاوەی قورئان". دەکرێت بڵێین (مالك کوڕی نبی)، هاوڕێی هزر و تاراوگەی، کە نزیکییەکی هزریی و ڕوحی قوڵ بەیەکیانەوە پەیوەست دەکات، بەشدارە لەگەڵی لە دامەزراندنی زانستی "سەرچاوەی قورئان" بەڵام لە ڕەوشتی قورئان دا کەس پێش دەراز نەکەوتووە و پێشی نەگەیشتووە تا ئەمڕۆ.

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بوارەکانی نوێکردنەوە لە هزری دەراز هەڵێنجین، لەگەڵ جەخت کردنەوە لەسەر ئەو دوو زانستە لە زانستەکانی قورئان، پاشان کۆتاییەکەی بە بەراوردێك دەهێنین لەنێوان مەنهەجی دەراز لە کۆڵینەوەی سەرچاوەی قورئان لەگەڵ مەنهەجی هاوڕێکەی.

زانستی ڕەوشتناسیی قورئان

دەراز توانی لە هەموو ئەوانە تییێبگات کە پێشتر نوسرابوو لەسەر ڕەوشتە قورئانییەکان لەلایەن زانایانی ڕۆژهەڵات و

ڕۆژئاوا، و هەڵسەنگاندنێکی پێشکەش کرد کە تێڕوانینە نوێکردنەوەییەکەی دەردەخات لە تێپەڕاندنی ئەوەی باو بوو. کتێبەکانی مێژووی ئیسلامیی کە لەسەر زانستی ڕەوشت نوسرابوون، لە ڕووی ناوەرۆك و مەنهەجەوە، دابەش کرد بۆ سێ بەش:

١- بەشێك ئامۆژگاریی کرداریی پێشکەش دەکات و هەوڵ دەدات قەناعەت بە خەڵکی بکات بۆ شوێنکەوتنی نمونەی باڵا، وەك کتێبی "مداواة النفوس"ی ابن حزم.

٢- بەشێك باسی دەرونی مرۆڤ و سروشتەکەی دەکات، و پێناسەی چاکە دەکات لەگەڵ لق و پۆپەکانی بەشێوازی نوسینی ئەرستۆ و ئەفلاتون. وەك کتێبی "تهذیب الاخلاق"ی ابن مسکویه.

٣- بەشێکیش هەردوو مەنهەجەکە کۆدەکاتەوە پێکەوە، وەك کتێبی "الذریعة"ی اصفهانی، و ژمارەیەك لە کتێبەکانی ابو حامد الغزالی، بەتایبەتی مەوسوعە فیقهییە ڕەوشتییەکەی"احیاء علوم الدین".

لە هەر سێ بارەکەی نوسینەکانی مێژووی ئیسلامییدا، دەراز ڕەخنەیان لێدەگرێت بەوەی کە ڕەسەن نین، و لاوازن لە وەرگرتن لە دەقی قورئانی، و شوێنکەوتووی هزری یۆنانیین، و پێی وایە ئەو پێویستییە پڕ ناکاتەوە بە شێوەیەکی قوڵ سەبارەت بە

زانستی ڕەوشتناسیی قورئان، چوون دەست پێکەکەی لە قورئانەوە نیە، و پشتی پێ نەبەستووە بە شێوەیەکی تەواو، بەڵکوبریتین لە"کتێبانێکی تەواو مرۆیی، نوسەرەکانی خۆیان ماندوو کردووە، تا بەرهەمی بیرکردنەوە و کۆڵینەوە فەلسەفییەکانیانی تیادا بنوسن، و دەقی قورئانی تیا دەرنەکەوتووە، یاخود دەردەکەوێت بەشێوازێکی پلە دوو".

دەراز نکوڵی ناکات لەوەی ژمارەیەك لە زانایانی موسوڵمانان هەوڵیان داوە لەگەڵ بابەتی ڕەوشتناسیی قورئان، لە بواری تیۆری. گفتوگۆ لەسەر بابەتی جوان و ناشیرین لە زانستی کەلام و بنەڕەتدا، و مەرجەکانی بەرپرسیارێتی لە کتێبی فیقهدا، و بابەتەکانی نیەت و دڵسۆزی لە کتێبی تەسەوفدا....هەموویان پەیوەستن بە ڕەوشتناسیی قورئانەوە. بەڵام ئەو زانایانەی قسەیان لەسەر ئەمانە کردووە، لە گۆشەنیگایەکی بچوکەوە قسەیان لەسەر کردووە، و داڕشتنێکی تیۆریی تەواویان نەکردووە بۆی؛ پشت بەست بە قورئان و بەڵگەهێنانەوە پێی، بەڵکو قسەکاران لەسەر ئەو چەمکانە پشتیان بە قورئان نەبەستووە"مەگەر بۆ بارێکی تەواوکاریی، بەڵگەی پێبێننەوە بۆ بیرۆکەیەك کە پێشتر هەبووە".

بەڵام لە بواری کرداریی ڕەوشتناسیی قورئان دا، واتە کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ئایەتانی پەیوەست بە ڕەوشتە

کردارییەکان، ئەوا زانایانی پێشینی موسوڵمانان بەشدارییەکی باشتریان کردووە بەراورد بە بواری تیۆریی. دەراز بە باشی باسی کتێبی "جواهر القران"ی الغزالی دەکات بەتایبەت، کە الغزالی هەوڵی داوە"ناوەرۆکی قورئان شیکاریی بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ دوو ڕەگەزی بنەڕەتی، یەکێکیان پەیوەستە بە زانیارییەوە، و ئەویتریان بە هەڵسوکەوتەوە".

بەڵام هەوڵەکەی الغزالی-وەك هەموو نوسەرەکانیتر دەربارەی حوکمەکانی قورئان وەك (بن العربی) و (الجصاص) و جگە لەوانیش- لاوازیی یەکێتیی لۆژیکیی و ڕێکنەخستنی مەنهەجییانەی ئایەتەکان، تێکی داوە، بۆیە"تەنها کۆکردنەوەی بابەتانێکی پەرتن، هیچ پەیوەندییەك لەنێویاندا نیە، و زنجیرەی بیرۆکەیان تێدا دەرناکەوێت". چەند زانایەکی شیعەی ئیمامی وەك ئەردەبیلی و جەزائیری-وەك دەراز تێبینی کردووە- توانیویانە ئەم کەموکورتییە پڕ بکەنەوە لە ڕێکخستنی لۆژیکیی فەرمانە قورئانییەکان، بەڵام بیرکردنەوەیان تەنها لەسەر بواری فیقهی بووە، و لەسەر بواری ڕەوشتیی نەبووە.

ئەمە لەسەر مێژووی ئیسلامیی بوو سەبارەت بە کۆڵینەوەکانی ڕەوشتناسیی قورئان. هەرچی مێژووی ڕۆژئاوایی ڕۆژهەڵاتناسیە، ئەوا دەراز دوای بیرکردنەوەیەکی قوڵ بۆی دەرکەوت لە چەند بوارێك دا کەموکورتیی گەورەی تیایە لە باس

کردنی ڕەوشتناسیی قورئانیی. ئەو کەموکورتییانەش پوخت دەکاتەوە لە سێ دانەدا:

یەکەمیان: بە ئارەزوو پشتگوێ خستنی تیۆری ڕەوشتناسیی قورئانیی لە نوسینەکانی بیرمەندانی ڕەوشتناسیی ڕۆژئاوا، ئەو پشتگوێ خستنەش دەرئەنجامی لایەنگیرییەکی بۆماوەییە دژی ئیسلام و ژیارەکەی. ئەو نوسینانە"بە کورتی بێت یان بە درێژیی، ئاماژە دەکات کە بنەما ڕەوشتییەکان سەرەتایان لە بتپەرستە ئیغریقییەکانەوەیە، پاشان ئاینزاکانی جوو و دیان، بەڵام کاتێك لە باسکردنی ئەو سێ قۆناغە دەبنەوە دەبینین ڕاستەوخۆ باز دەدەن بۆ سەردەمانی نوێ لە ئەوروپا، لەگەڵ پشتگوێ خستنی هەر شتێکی پەیوەست بە دەستوری ڕەوشتناسیی لە قورئان".

دووەمیان: تێڕوانینێکی سنورداری زانایانی ڕۆژهەڵاتناسی ڕۆژئاوا بۆ بنەماکانی ڕەوشت لە قورئان دا، بە پشتگوێ خستنی بواری تیۆریی کە وێنا دەبێت لە هەڵێنجانی تێڕوانینێکی قورئانییانەی کامڵ بۆ زانستی ڕەوشتناسیی، و بە لاوازیی خوێندنەوەی سەرجەم ئایەتە قورئانییەکانی پەیوەست بە هەڵسوکەوت، کە هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان هەوڵیان داوە ڕیزیان بکەن و کۆیان بکەنەوە.

**سێیەمیان: گرفتەکانی خراپ مامەڵە کردن لەگەڵ زمانی عەرەبی، کە زمانی قورئانە، و لاوازیی تێگەیشتن لێی و چێژ لێوەرگرتنی لای ڕۆژهەڵاتناسە ڕۆژئاواییەکان. نوسینەکانی ئەمان گرفتی وەرگێڕانی ناڕاستی تێدایە، یاخود پوختە کردنێکی خراپ، یاخود هەردووکیان پێکەوە، وەك دەراز تێبینی کردووە.**

**دوای ئەم گەڕانە هەڵسەنگاندن ئاسایە بە مێژووی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا، دەراز گەیشتە ئەو دەرئەنجامە لۆژیکییەی بەدوای ئەمەدا دێت، ئەویش"ڕەوشتناسیی قورئانیی بابەتی سەرەکی نەبووە بۆ کۆڵینەوە و یاسادانان لای موسوڵمانان و ڕۆژهەڵاتناسانیش، نە لە ڕووی تیۆرییەوە و نە لە ڕووی کردارییەوە"، "بەم چەشنە کەس-هێندەی ئێمە بزانین-هەڵنەساوە بە هەڵێنجانی ڕێسای ڕەوشتناسیی لە قورئانەوە بە گشتی، و کەسیش هەوڵی نەداوە بنەما و یاساکانیمان پێبڵێت لە شێوەی بینایەکی یەکگرتووی سەربەخۆ لە هەر بوارێکی تری نزیك لێی. ئەوەش ئەو کارەیە کە خۆمان تەرخان کرد بۆ بەدیهێنانی، بە ئەندازەی ئەوەندەی ئامرازەکانی بەردەستمان بوارمان بدات".**

**دەراز پەی برد بەوەی بە ڕێیەك دا دەڕوات کە هێشتا کەسی پیا نەڕۆشتووە، و پێویستە کارێکی بناغەسازیی بکات لە زانستی ڕەوشتناسیی قورئان. لێرەدا خستنەسەرەکەی پڕ بایەخە**

بەڕاستی، ئەویش بەرهەمی هەوڵ و ناڕەحەتییەکی هزریی زۆر قوڵە، تەنها کەسێك هەستی پێدەکات کە کارامە بێت لە "دستور الاخلاق فی القران" و زیاتر لە جارێك خوێندبێتیەوە.

نوێکردنەوەی دەراز، کاتێك بناغەی دانا بۆ زانستی ڕەوشتناسیی قورئان، دوو بەش بوو:

یەکەم: مەنهەجی باس کردنی، ئەویش کاتێك زانستی ڕەوشتناسیی تیۆری-کە بەشێکە لە فەلسەفە- خستە نێوجەرگەی ڕۆشنبیریی ئیسلامی، و بەناوەرۆکێکی قورئانیی دایڕشت. لەو بارەیەوە دەڵێت:"لێرەوە جیاوازی نێوان مەنهەجی ئێمە و مەنهەجی ئەوانیتر دەردەکەوێت، ئەویش چونکە زۆرێك لەوەی گرنگە لای زانایانمان بەشێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە بواری ئابوری یاخود شەرعی. ئێمە سەرەتا جەخت دەخەینە سەر بواری ڕەوشتیی، هەموو بابەتەکانیش بەگوێرەی دەستەواژەی ڕەوشتناسە نوێکان دادەڕێژین".

دووەم: ناوەرۆك، دەردەکەوێت لە تێروانینە وردەکانی دەرازەوە، کاتێك شەرحی تێروانینی قورئانییانە دەکات بۆ بڕگە و چەمکە سەرەکییەکانی زانستی ڕەوشتناسی، ئەوانیش: پابەندکەر، بەرپرسیارێتی، پاداشت، پاڵنەر، هەوڵ. پاشان ئاشکرا کردنی فراوانیی و قوڵیی و هاوسەنگیی و گونجان لەگەڵ سروشتی ساغ کە ڕێنماییە قورئانییەکانی پێ دەناسرێتەوە لەم بڕگانەدا.

## زانستی سەرچاوەی قورئان

ئەگەر دەراز دامەزرێنەری شایستەی (زانستی ڕەوشتناسی قورئان) بێت، ئەوا دامەزرێنەری زانستێکی دیکەی نوێیە لە بواری کۆڵینەوە قورئانییەکان، دەکرێت ناوی بنێین (زانستی سەرچاوەی قورئان). زانستی سەرچاوەی قورئان پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە زانستی (ئیعجازی قورئان) بەو واتا ڕەوانبێژییەی زۆرێك لە زانایانی پێشین دەربارەی نوسیویانە، وەك (الباقلانی)، و (الرازی)، و (السیوطي)، و لە هاوچەرخەکانیش وەك (الرافعی)، و (محمود شاکر). بەڵام زانستی سەرچاوەی قورئان ئاسۆی فراوانترە، و گونجاوترە لەگەڵ جیهانیی بوونی پەیامی ئیسلامی، وەك دواتر باسی دەکەین. دەکرێت بواری نوێکردنەوە و خستنەسەری دەراز لە سێ خاڵدا پوخت بکەینەوە:

یەکەم: فراوان کردنی چەمکی "ئیعجازی قورئان" بۆ چەمکێکی نوێی فراوانتر، کە تەنها بواری شێوازی زمانەوانی نەبێت وەك ئەوەی پێشین جەختیان لەسەر کردووە، بەڵکو هەموو ئەوانە بگرێتەوە کە بەڵگەن لەسەر خودایی بوونی پەیامی قورئان، و گومانی مرۆیی بوونی سەرچاوەی قورئان پوچەڵ دەکاتەوە.

دووەم: گۆڕینی مەنهەجییەتی بەڵگەهێنانەوە لەسەر خودایی بوونی سەرچاوەی قورئان، تا ببێتە کۆڵینەوەیەکی ئاوێتە لەو

چێوە مێژوویی و ڕۆشنبیرییەی قورئانی تێدا هاتۆتە خوار، لە "دەرخستنێکی مێژوویی و شیکاریی بەراودکاریی" بەڵگە بێت لەسەر ڕەسەنایەتی پەیامی قورئان و سەرچاوە خوداییەکەی.

سێیەم: بەکارهێنانی مەنهەجێکی نوێ بۆ ئەو مەبەستە، ئەویش مەنهەجێکە من لێرەدا ناوی دەنێم مەنهەجی "دەورەدانی لۆژیکی". ئەویش مەنهەجێکی قورئانیی ڕەسەنە. و دواتر ڕوکارەکانی جێبەجێ کردنی ئەم مەنهەجە دەبینین لای دەراز.

با تۆزێك درێژە بدەین بەو گۆڕینە مەنهەجییەی دەراز و (مالك کوڕی نەبی) دایانهێنا بۆ سەلماندنی سەرچاوەی خودایی قورئان.

زانایانی ئیسلام وا ڕاهاتبوون بەڵگە بهێننەوە بۆ ڕەسەنایەتی پەیامی قورئان لە دەروازەی ڕەوانبێژیی زمانەوانییەوە. بەڵام دەراز دەسپێکی وابوو کە کۆڵینەوەی شیکاریی قورئان لە چەند گۆشەیەکەوە دەکرێت، "بەڵام هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ جەمسەری سەرەکی: زمان و هزر". پاشان بڕیاری دا کە کۆڵینەوەکەی وی بۆ قورئان"سەربەخۆ بێت لە زمان". ئەمەش مەنهەجییەتێکی نوێی جودایە لە مەنهەجییەتی بۆماوەی سەلماندنی پەیامی قورئان.

یەکێك لە داخوازییەکانی ئەم گۆڕینە مەنهەجییە، هەست کردنی دەراز بوو، لە کاتی نوسینی کتێبی"مدخل الی القران

الكريم" به زمانی فەرەنسی، بەوەی چەمکی ئیعجازی زمانەوانی بەس نیە بۆ قایل کردنی خوێنەرە ئەوروپییەکان-و ئەوانەی تریش کە زمانیان عەرەبی نیە- بە ڕەسەنایەتی پەیامی قورئان، و زانایانی ئیسلام پێویستییەکی زۆریان هەیە بە هێنانە پێشی شێوازێکی نوێ لە بەڵگەهێنانەوە بۆ دواندنی ئەو خەڵکانە، کە زۆرینەی مرۆڤایەتین.

بەڵام لێرەدا پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە دەراز ئیعجازی زمانەوانی پشتگوێ نەخستووە لە کتێبەکەی پێشویدا کە دەربارەی هەمان بابەت نوسیبوی، ئەویش کتێبی "النبأ العظيم"ە، بەڵکو چەندین لاپەڕەی تەرخان کردووە بۆ ئاشکرا کردنی موعجیزەی زمانەوانیی قورئان، و تێروانینێکی وردی قوڵی خستۆتە ڕوو، و تیایدا وەسفی"پێکهاتەی دەنگیی" و "جوانیی جێکەوت"ی قورئانی کردووە. ئاشکراشی کردووە کە قورئان"نایابی و گەورەیی پەخشانی هەیە، لەگەڵ جوانیی و چێژی شیعر" و شێوازەکەی"نە ژیارییەکی ساردە، و نە دەشتەکییەکی زبر" و "ڕێگرییەکی سروشتیی هەیە کە ڕێگریی نەیارانی کردووە لە دەستێوەردان و تا ئێستاش دەیکات". پێشنیازی ئەزمونێکی کرداریی جوانی کردووە بۆ تێگەیشتن و چێژوەرگرتن لە ئاوازی دەنگیی قورئان، کە بەڵگەیە لەسەر هزرە ئەزمونگەراییەکەی دەراز.

بەڵام ئەو بواری ئیعجازی زمانەوانییەی دەراز باسی دەکات، پێشتر باس کراوە، و زانایانی ڕەوانبێژیی پێشتر لەسەریان نوسیوە. دەراز ویستی موعجیزەی ڕەوانبێژیی قورئان تێپەڕێنێت کە ناوی ناوە"توێکڵی ڕوکەشی جوانیی قورئان" بۆ ئەو موعجیزە ناوەرۆکییەی هەموو مرۆڤێك پەی پێدەبات، بە هەر زمانێك قسە بکات.

لە بەرهەمەکانی ئەم مەنهەجیەتە نوێیە، گواستنەوەی قورئانە لە چێوەی ڕۆشنبیریی عەرەبییەوە، بۆ چێوەی جیهانیی، ئەمەش مەبەستی دەرازە لە "دەربازکردنی بیرۆکەی قورئان لە بەرگەکەی، و دەرهێنانی بەم شێوەیە لە چێوە لۆکاڵیەکەیەوە بۆ نزیك کردنەوەی لە هزری ئەوروپیی دور لە زمانی عەرەبی". ئەوانەی سەلماندنی ڕەسەنایەتی پەیامی قورئانیان کورتکردۆتەوە لە ڕەوانبێژی زمانەوانیی عەرەبی ئەوا سنوریان داناوە بۆ چوارچێوەی پەیامەکە و جیهانیی بوونی، و ڕێگەیان نەداوە قورئان لەبەر دەستی هەموو مرۆڤایەتیی دا بێت.

دەکرێت گۆشەنیگاکانی دەراز لێیانەوە ڕوانیویەتییە قورئان، دابەش بکەین بۆ سیان:

یەکەمیان: گۆشەنیگای مێژوویی، تیایدا دەراز سود لە ژیانی پێغەمبەر (دروی خودای لەسەر) وەردەگرێت، و شوێنی وردەکارییەکانی ژیانی دەکەوێت لە پێش پێغەمبەرایەتی و کاتی

پێغەمبەرایەتییش، لەگەڵ ئاگادار بوون لە هەموو ئەو شتە دەرەکییانەی کاریگەریی هەبووە لەسەر کەسایەتیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)، بۆ ئەوەی سروشتی ڕاستگۆیی و دڵسۆزیی بسەلمێنێت لە ژیانی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر). پاشان دەراز شوێن مێژووی کۆکردنەوەی قورئان دەکەوێت بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)و نەوەکانی مرۆڤایەتیی بسەلمێنێت تا ئەمڕۆ.

دووەمیان: گۆشەنیگای شیکاریی، تیایدا دەراز بەڵگە لە قورئان خۆی دەهێنێتەوە لە ناوەرۆکی بیروباوەڕیی و ڕەوشتیی، بۆ دەرخستنی بڵندیی ئەم پەیامە، و ڕۆچوونی لەناو کەسایەتیی مرۆڤ دا، و کاریگەریی مێژوویی ناوازەی لە قوڵیی و خێراییەکەیدا لە ژیانی نەتەوەکان و گەلان، و بەرێزییەکەی کە ناکرێت سەرچاوەکەی جگە لە بەدیهێنەر و ڕاگری ئەم گەردونە بێت.

سێیەم: گۆشەنیگای لۆژیکیی، تیایدا دەراز مەنهەجی قورئان دەخاتە ڕوو لە سەلماندنی سەرچاوە خودایییەکەی، لەڕێی گفتوگۆ لەگەڵ بتپەرستان و خاوەن کتێبان دەربارەی ناوەرۆکی پەیامەکە و ڕەوشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) پێش پێغەمبەرایەتی و کاتی پێغەمبەرایەتییش. هیچ شتێکیش

**هێندەی قورئان خۆی زمانپاراو نیە بۆ سەلماندنی ڕەسەنایەتیی قورئان.**

**بەڵگەکانی دەراز بەڵگەی دەمکوتکەرن، کە دەکرێت دابەشیان بکەین بۆ سێ چەشن:**

- **چەشنێك تایبەت بە کەسایەتیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر).**
- **چەشنێکی پەیوەست بە ناوەرۆکی پەیامەکە.**
- **سێیەمیش وەرگیراوە لە چێوە مێژووییەکەی.**

**ئێمەش بەڵگەکان کورت دەکەینەوە لێرەدا، لەگەڵ دانپێدانان بەوەی کە هەر کورت کردنەوەیەك وا دەکات مافی خۆی نەدەینێ، بەڵکو هاندانی خوێنەرە بۆ خوێندنەوەی نوسینەکەی دەراز خۆی لەم بابەتەدا، چوون ئەو زمانپاراوترە و بەڵگەی بەهێزترە.**

**لە بەشی یەکەمدا دەکرێت بڕیار لەسەر ڕەسەنایەتیی پەیامەکە بدەین لەڕێی کۆڵینەوەی ژیانی هەڵگری پەیامەکە. چوون جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ڕاستگۆ و دوڕو، و لەنێوان پاك و فێڵاوی. بۆیە عبداللە کوڕی سلام (خودا لێی ڕازی بێت) توانی بە سەیرکردنێکی خێرای ڕووی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) بزانێت کە ئەو ڕووە ڕووی کەسێکی درۆزن نیە. عبداللە وتی: "کاتێك پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) هات بۆ مەدینە، خەڵکی چون بەرەوپیری، و وترا پێغەمبەری خودا (درودی**

خودای لەسەر) هاتووە. دەڵێت جا منیش لەناو خەڵکیدا چوم بەرەوپیری تا بیبینم، کاتێك ڕوویم بینی زانیم: ئەو ڕووە ڕووی کەسێکی درۆزن نیە.." هەروەك عبدالله کوڕی ڕەواحەی هاوەڵی پێغەمبەر و شاعیر دەڵێت:

**لو لم تكن فيه آيات مبينة**

**كانت بديهته تنبيك بالخبر**

واتە: ئەگەر نیشانەیەکی ئاشکرای تیا نەبووبێت، ئەوا وریایی و بەئاگاییەکەی هەواڵی پێدەدایت

بەڵام ئەو کەسانەی کە وریایی و ئاگاییەکەی عبداللەی کوڕی ڕەواحەیان نیە و فیراسەتەکەی عبداللەی کوڕی سەلامیش، ئەوا پێویستیان بە بەڵگەی لۆژیکی هەیە کە پێشەکی و ئەنجامی هەبێت. دەرازیش کتێبی "النبأ العظيم" و "مدخل الى القران الكريم"ی بۆ ئەوانە نوسی، و ئاشکرای کرد ژیانی محمد (درودی خودای لەسەر) پێش پێغەمبەرایەتی ناسراو بوو بە ڕاستگۆیی و دەستپاکیی، و دۆست و دوژمنیشی گەواهی ئەوەیان بۆ دەدا، لەگەڵ نزیکان و دورانیش. لۆژیکی مێژووییش وا دەخوازێت ڕاستگۆییەکەی وەربگیرێت دوای ئەوەی گەیشتە چلساڵی و تەمەنی کامڵ بوون، و بوارەکانی کەسایەتیی دامەزرا.

دەراز دەڵێت:"هەر کەس ورد بێتەوە لە ژیانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) لە جوڵە و دانیشتنی، و دەربڕین و

ئاماژەکانی، و قایل بوونی و توڕە بوونی، تەنهایی و لەناو خەڵك بوونی، گومانی نابێت لەوەی دورترین کەس بووە لە گومان و فرت و فێل، و پەنهانیی و ئاشکرای وەك یەك بوون لە ڕاستگۆیی وردی و یەکلابوونەوەی لەسەر ڕاستیی، لە کاروباری بچوك و گەورەی، و ئەوەش دیارترین سیفاتی بوو پێش پێغەمبەرایەتی و کاتی پێغەمبەرایەتییشی، هەروەك گەواهی ئەوەی بۆ دەدات دۆست و دوژمنی تا ئەمڕۆمان".

لەگەڵ ئەوەی گەورەترین بەڵگە لەسەر ڕەسەنایەتیی پەیامی قورئان بریتییە لە سەربەخۆ بوونی لە کەسایەتیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) چوون دەقی مرۆڤکرد کاریگەرییەکانی کەسایەتیی خاوەنەکەی پێوە دیارە، و ڕەنگاوی دەبێت بە ڕەنگەکانی دەرون و ئارەزوی، بەڵام پەیامە خوداییەکان بەو جۆرە نین، بەڵکو بەزرترە لە کەسایەتی نێردراوەکە و دەرونی، و لۆژیکی خۆی-واتە پەیامەکە- زاڵ دەکات بەسەری-نێردراوەکە-دا، و ڕێنماییشی دەکات-نێردراوەکە- بە بڕیارەکانی-پەیامەکە-. خودا فەرمووی قورئان پێویست کراوە لەسەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر)، و بەسەریدا خوێندراوە:"إن الذي فرض عليك القرآن لرادك الى معاد" (القصص: ٨٥) ، "إنا سنلقي عليك قولا ثقيلا" (المزمل: ٥)

له دیاردەکانی سەربەخۆیی پەیامی قورئانیی له کەسایەتیی پێغەمبەر ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: دواکەوتنی سروش لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر حەزی دەکرد سروشی بۆ دابەزێت بگرە زۆریش پێویستی پێی بوو. و ئاشکرایه ئەگەر دیاردەی سروش "مرۆڤکرد و زۆرلەخۆ کردن بوایه ئەوا بەدەستی خۆی دەبوو، و ڕۆژێك نەبوو حەز بکات قورئانی نوێ بهێنێت ئەوا دەیهێنا". و بابەتی ڕوداوی درۆهەڵبەستنیش بۆ عائیشه باشترین نمونەیه بۆ ئەمه، بەجۆرێك:"سروش دواکەوت، و بابەتەکه خایاندی و خەڵکیش قسەیان دەکرد، تاوەکو دڵەکان گەیشتنه قورگ".

جا دەتوانی وێنای ئەو ئازاره دەرونییه بکەیت که پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر) چەشتی، خۆی و خانەوادەی و خێزانه پاکەکەی، لەناو کۆمەڵگەیەکی عەرەبی دا که بەهای شەرەف تیایدا زۆر باڵایه لەگەڵ پاکیزەیی، زیاد له هەر بەهایەکیتر. ئەویش ناتوانێت بەرگری له شەرەفی خۆی و خێزانی بکات، بەڵکو پێویسته لەسەری بگەڕێ و ڕاوێژ بکات و ئارام بگرێت، و چاوەڕێی بڕیاری خودا بکات.

دەراز دەپرسێت به بەڵگەیەکی باوەڕ پێکەرەوە: چی وای له پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) کرد ئەو هەموو ناڕەحەتییه بچێژێت بەدرێژایی مانگێکی تەواو تا سروش دابەزێت بۆ

سەلماندنی پاکێتیی عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت)؟و "چی ڕێگر بوو، ئەگەر فەرمانی قورئان بەدەستی خۆی بوایە، کە ئەو قسە یەکلاکەرەوەیە دروست بکات پێشتر بۆ ئەوەی شەرەفی خۆی و ماڵەکەی پێ بپارێزێت، و بیشیداتە پاڵ سروشی ئاسمان، تا زمان درێژانی پێ دەمکوت بکات؟" بێ گومان تاکە ڕێگر لەوە ڕاستگۆیی و دڵسۆزیی و سەربەخۆیی پەیامە خوداییەکەیە لە کەسایەتییە مرۆییەکە.

دووەم: دابەزینی سروش جودا لەوەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) دەیەوێت و ئاواتە خوازیەتی. بەڵکو قورئان هاتۆتە خوارەوە و کرداری پێغەمبەری (درودی خودای لەسەر) "بە هەڵە داناوە لە بابەتێك کە پێی باش بووە، و ڕێگەی پێدەدات بۆ بابەتێك کە خۆی حەزی پێی نیە، خۆ ئەگەر هاتوو تۆزێك لەسەرخۆیی تیا کرد ئەوا قورئان سەرکۆنەی توندی دەکات، و ڕەخنەی توندی لێدەگرێت". بۆ وێنە، فەرمایشتی خودای گەورە:﴿عفا الله عنك لم أذنت لهم﴾ (التوبة: ٤٣).﴿و تخفي في نفسك ما الله مبديه و تخشى الناس و الله احق ان تخشاه﴾ (الاحزاب: ٣٧) ﴿اما من استغنى فانت له تصدى﴾ (عبس: ٥-٦)﴿يا ايها النبى لم تحرم ما احل الله لك﴾ (التحريم: ١)

هزری ڕۆژهەڵاتناسیی پڕ لە لایەنگیری مێژوویی و ماددەگەرایی، لەو مەبەستە لۆژیکییە تێنەگەیشتوە کە ئەم بابەتە

قورئانییانه هەیانە، و بەڵگە بونی لەسەر ڕەسەنایەتیی پەیامەکە لە کەسایەتیی پێغەمبەر. بۆیە هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان لایەنێکی ئەندێشەی دەرونیان گرتووە بۆ ڕاڤە کردنی ئەم دیاردەیە، جا گێڕاویانەتەوە بۆ ئەوەی کە ناخی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) ئازاری پێگەیشتووە لەو ڕەفتارانەی خۆی بۆیە ئەو ئایەتانەی نوسیوە تا لەو ئازارە ڕزگاری بکات. بەڵام دەرازی زانا وەڵامێکی دەمکوتکەریان دەداتەوە و دەڵێت:"ئایا ئەگەر سەرچاوەی ئەم سەرکۆنە کردن و ڕەخنە گرتنە، خودی پێغەمبەر خۆی بوایە، بەو شێوەیە گەورەی دەکرد لە خۆی؟ ئایا لە بێدەنگ بوونی لەمانە داپۆشینی هەڵەی خۆی نەبوو، لەگەڵ ڕاگرتنی ڕێزی بۆچونەکانی خۆی؟...بەڵام ئەوە سروشە بۆیە ناتوانێت بیشارێتەوە﴿و ما هو على الغيب بضنين﴾".

ئەو داناییەی پشتی ئەم جۆرە ئایەتانەش کە ڕۆژهەڵاتناسان لێی تێنەگەیشتون بریتییە لە ئاشکرا کردنی"پلەی خودایەتی و پلەی بەندایەتی، و ڕێبازی بەرزکردنەوەی خۆشەویستە بە پلەکانی فێرکردن و ئەدەب پێدان". پاشان بوون و مانەوەی ئەم ئایەتانە لەنێو دوو بەرگی قورئان لە دیارترین بەڵگەکانی سەربەخۆیی پەیامەکەیە لە کەسایەتی پێغەمبەر و ویستی ئەو، و بەهێزترین بەڵگەیشە لەسەر ئەوەی سەرچاوەی قورئان ئەو هێزە خودایيە بڵندەی سەرو هەموو حەزە مرۆیی و

زەمینییەکانەوەیە،"ئەو هێزەی کە پاڵنەر و ئارەزوو دەستی تێوەرنادەن، بەڵکو پەیامی خۆی دەگەیەنێت بۆ جیاکردنەوەی ڕاستی و پوچیی، و پێوانەی پیسی و پاکییە، جا خەڵکی حەزیان لێی بێت یا ڕق، پێی قایل بن یان توڕە، باوەڕ بهێنن یان بێ باوەڕ بن، چوون نە گوێڕایەڵی گوێڕایەڵان هیچی لێ زیاد دەکات و نە سەرپێچی سەرپێچیکاران. و جیاوازی زۆرە لە نێوان گەورە و ژێر دەستە، و پەرستراو و بەندە".

دەورەدانێکی لۆژیکی

بابەتەکە هەرچۆن بێت، گریمانەی سەرچاوەی قورئان لە سێ ئەگەر بەدەر نیە:

١- لە ئاوەز و دڵی پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر) هەڵقوڵا بێت.

٢- یاخود لە سەرچاوەیەکی مرۆیی پێشتر لە خۆی یان هاوسەردەمی خۆیی وەرگرتبێت.

٣- یاخود سەرچاوەیەکی خودایی هەبێت لە سەروی کات و شوێنەوە.

ئەگەری یەکەم، کە سەرچاوەی قورئان لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) خۆیەوە بێت، ئەوە هەموو سەرچاوە مێژوییە متمانە پێکراوەکان ڕەدی دەکەنەوە لە ژیانی هەڵگری پەیامەکەوە. لەبەر ئەوەی نەخوێنەوار بوو و لەنێو گەلێکی

نەخوێنەواردا ژیا. هەروەك ناوەڕۆكی پەیامەكە نەفی ئەوە دەكات بەو زانست و داناییانەی لەخۆیی گرتووە كە مەحاڵە گەیشتن پێیان بە بۆچونی خودیی و زانستی بەدەستهێنراو، بە گریمانەی ئەوەی هەڵگری پەیامەكە لە ڕوی زانستەوە لە هەمو كەسەكانی سەردەمی خۆی زاناتر بێت و مومارەسەی نوسین و خوێندنەوەیشی لە هەمویان زیاتر بێت.

ئەو زانستە پەنهانانەی قورئان لەخۆی گرتوون-و زۆریان ڕویاندا و خەڵكانێكی زۆریش بینیان- ناكرێت بگێڕدرێنەوە بۆ سەرچاوەیەكی مرۆڤكردی سەردەمی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) بەڵكو هیچ سەردەمێكی دواتریش، ئەویش لەبەر ئەوەی"بواری نەبینراو-الغیب- گلۆپەكانی فیراسەت و زیرەكی تیایدا كارناكەن" وەك دەراز دەڵێت. هەروەك شیكاریی شێوازی قورئان دەیسەلمێنێت؛ گومان نیە لەوەی قورئان دانراوی محمد (درودی خودای لەسەر) نیە، چوون دەیان هەزار لە قسەكانیمان پێگەیشتووە و هیچیان هاوشێوەی قورئان نین لە دانان و شێواز و داڕشتن دا، بەڵكو"دەبینین شێوازی قورئانیی شێوازێكە، و شێوازی پێغەمبەر شێوازێكیتر، كە لەگەڵ قورئان دا دەرنابات". بەم چەشنە ناوەڕۆك و شێواز گەواهیان دا لەسەر سەربەخۆیی پەیامی قورئان لە كەسایەتی پێغەمبەر.

ئەگەری دووەم، کە قورئان وەرگیراو بێت لە ئاینزایانێکی دی کە نەماون، و پەیامانێکیتر کە لەناو چوون، ئەوە مێژوو و لۆژیك و بەراوردی پەیامی قورئانیی لەگەڵ پێش خۆی، ڕەدی دەکەنەوە. شاراوە نیە، لێکچونێکی گەورە هەیە لەنێوان قورئان و هەندێك لە کتێبی گاور و جووەکان، و قورئان خۆیشی ئەمە باس دەکات. جا ئایا ئەمە وەرگرتنی دواترە لە پێش خۆی-وەك خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان دەڵێن- یاخود ئەمە یەك سەرچاوەیی پەیامە خوداییەکانە وەك موسوڵمانان جەختی لەسەر دەکەنەوە؟ هەموو بەڵگەکان ئەوەی دووەم دەسەلمێنن و ئەوەی یەکەم ڕەد دەکەنەوە. قورئان جەخت دەکاتەوە کە پەیوەندی وی لەگەڵ کتێبەکانی پێش خۆی بریتییە لە بەڕاست دانان و زاڵ بوون﴿و انزلنا اليك الكتاب بالحق مصدقا لما بين يديه من الكتاب و مهيمنا عليه﴾ (المائدة: ٤٨) چوون ئەو پشتڕاستی ئەوانە دەکاتەوە کە ڕاستن تیایاندا، و ئەوانەشی ناڕاست و دەستکاریی کراون ڕاستیان دەکاتەوە، و جیاوازییش زۆرە لەنێوان قوتابییەك تەنها وەردەگرێت و مامۆستایەکیش پەی دەبات بە بابەت.

دەراز لیستێکی گەورەی هێناوە لەو بابەتانەی قورئان ڕاستی کردوونەوە بۆ بیروباوەڕی خاوەن کتێبان و ئەفسانەکانیان، لەناو ئەوانەدا ڕاست کردنەوەی هەڵەی مێژوویی و زانستیی لەناو کتێبی پیرۆز کە لەبەر دەستیاندایە، پاشان دەپرسێت:"ئایا

لەمانەدا وێنەی مامۆستایەك دەبینیت كە خاوەنی قورئان زانستەكانی خۆییان لێوەرگرێت؟یاخود بەپێچەوانەوە مامۆستایەك دەبینیت هەڵەكانیان بۆ ڕاست دەكاتەوە و باری خراپیان دەلاوێنێتەوە؟" پاشان بە دڵنیاییەوە دەڵێت:"بڕوانە ئەم ئایەتانەی سورەتی (النحل) و (النمل) كە لە مەككە هاتونە خوار، چۆن مەبەستی سەرەكی ئیسلامی كردووەتە ئاشكرا كردنی ئەوەی خاوەن كتێبان ناكۆكن لەسەری، بەڵكو ئەمەی كردووەتە یەكەمی مەبەستەكانی".

هەرچی چێوەی ڕۆشنبیری بتپەرستانەیشە كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) تیایدا لەدایك بووە و گەورە بووە، ئەوە دوورترە لەوەی سەرچاوەی ئەو بیرۆكە و بنەما گەورانەی نێو سورەت و ئایەتەكانی قورئان بێت. لەبەر ئەوەی قورئان گیانی سەردەمەكەی و ئاستی زانستیی و ڕۆشنبیریی و ڕەوشتییشی تێپەڕاندووە بەشێوازێك كە پێوانە ناكرێت، ئەمەش نهێنی ئەو شۆڕشە گیانی و كۆمەڵایەتییەیە كە دایمەزراند لە ژیانی عەرەب و گەلانیتری وەرگری پەیامی ئیسلام. ئەوانەی دەڵێن وێنای گیانی سەردەمەكەی خۆی دەكات، بە واتای ئەوەی بەرهەمی سەردەمی خۆیەتی، ئەوا خۆبەگەورەزانن یاخود نەزانن بەرامبەر مێژووی عەرەب و سەردەمانی هاتنە خوارەوەی قورئان. دەراز گاڵتە بەوانە دەكات كە دەڵێن قورئان وێنای سەردەمی خۆیەتی و

دەڵێت:"وێنای دەکات بە باشترین وێناکردن، پاشان تێکی دەشکێنێت بە خراپترین تێکشکاندن".

پاشان شێوازی پەیامی قورئانیی دێت لەگەڵ چوارچێوە زمانەوانییە موعجیزەئاساکەی کە تەحەددا دەکات. چوون پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) —بە فەرمانی خودا- تەحەددای هەموو مرۆڤایەتیی و پەریی کرد لە دانانی هاوشێوەی قورئان یاخود سورەتێکی قورئان، بەڵام دەستەوسان بوون، و"چ شتێك هێندەی دەستەوسان کردن بەڵگەیە لەسەر ئیعجاز؟". ئەم حاڵەتی تەحەددایەش نەدەکرا دەسپێشخەرییەکی تەواوی مرۆیی بێت کە خاوەنەکەی پەی ببات بەوەی ئەو بابەتەی دڵی دایدەهێنێت و زمانی دەریدەبڕێت، لەبەر دەستی کەسانیتریشدایە، و ئەوانیش لە توانایاندایە هاوشێوەی بهێنن، بەڵکو ئەوە "گرەوێکە هەرگیز لە کەسێك ناوەشێتەوە بیکات کە ڕێزی خۆی بزانێت، مەگەر دڵنیای تەواو دڵنیا بێت لەوەی ئەندازەگیریی خودایی پشتگیریەتی و بەردەوامیش هەواڵی پێدەدات".

دوای پوچەڵ کردنەوەی گریمانەی یەکەم کە دەڵێت قورئان دانراوی محمد (درودی خودای لەسەر) خۆیەتی، و گریمانەی دووەم کە دەڵێت وەرگیراوە لە سەرچاوەیەکی مرۆڤکردەوە، تەنها ئەوە دەمێنێت لەبەردەممان دا: تەسلیم ببین بەوەی"ئەم قورئانە سروشتەکەی ڕێگە نادات مرۆڤکرد بێت، بە زمانی حاڵ بانگ

دەكات كە پەیامی ئەندازەگیریی و بڕیاردانە-مەبەستی خودایە، وەرگێڕ-. ئەگەر لەناو بیابانیش بدۆزرێتەوە، ئەوا خوێنەرەكەی دڵنیا دەبێت هی ئەم سەر زەویە نیە و سەرچاوەكەشی زەوی نیە، بەڵكو لە ئاسۆكانی ئاسمانەوە سەریدەرهێناوە و هەڵهاتووە". ئەوە تاكە ئەگەری سەلمێنراوە بە بەڵگەكانی ژیانی هەڵگری پەیامەكە، و چێوەی مێژوویی دابەزینی، و ناوەڕۆكی پەیامەكەش.

قورئان تەحەددای هەموو مرۆڤایەتی كردوە لە بەدیهێنانی هاوشێوەی بەدیهێنراوەكانی خودا ئەگەر مێشولەیەكیش بێت، یاخود هاوشێوەی فەرمانی خودایی بهێننە ئاراوە ئەگەر دانانی سورەتێكیش بێت وەك سورەتەكانی قورئان، جا تەحەددایەكی چەند گەورەی هەمیشەییە كە بەڵگەیە لەسەر تەنهایی خودا لە بەدیهێنان و بڕیاردانی:"الا له الخلق و الامر، تبارك الله احسن الخالقين" (الاعراف: ٥٤)

**نزیكایەتیی هزریی**

لە سەرەتای ئەم كۆڵینەوەیە ئاماژەمان كرد بۆ نزیكیی هزریی نێوان دكتۆر محمد عبدالله دەراز و فەیلەسوف مالك كوڕی نەبی، ئێستا كاتی درێژەدانە بە بنەما مەنهەجییەكانی ئەم نزیكییە. گەورەترین خولیای ئەم دوو بیرمەندە گەورەیە ئەوەبوو بیسەلمێنن مەحاڵی لۆژیكییە قورئان پاڵدانە لای سەرچاوەیەكی مرۆڤكرد، و ئاوەزی دروست ناتوانێت ڕابكات لە ڕاستیی سەرچاوە

خوداییەکەی. ئەم دوو پیاوەش دوو ڕێبازی نزیکیان گرتەبەر لەم بوارەدا، بەڵکو خەریکە تەواو هاوشێوە بن.

دەراز نێوەرۆکی ئەم زانستەی ئاشکرا کرد لەو پێشەکییەی بۆ چاپە فەرەنسییەکەی یەکەمی کتێبی (دیاردەی قورئانیی) نوسی، کە هاوڕێ و هاوگەشتە هزرییەکەی مالك کوڕی نەبی، نوسی:"بابەتەکە گەڕانە لەدووی سەرچاوەی ڕاستەقینەی قورئان. و بزانین گوایە دەکرێت و دەگونجێت ئەم کتێبە لە زانین و پەی بردنی ئەو کەسەوە هاتبێت کە پێیدا نێردراوە، یاخود لە زانیاریی مرۆییەوە بەشێوەیەکی گشتی، یاخود پێچەوانەی ئەوە، هۆکارانێك هەن بڕوامان پێدەهێنن بۆ باوەڕهێنان بە سەرچاوە بڵندە خواییەکەی".

ئەو سێ ئەگەرەی دەراز باسی کردن لە هەردوو کتێبی:"النبأ العظیم" و "مدخل الی القران الکریم"، و پووچیی ئەگەری یەکەم و دووەم، و ڕاستیی سێیەمیشی ئاشکرا کرد...مالك کوڕی نەبی لە کتێبی (دیاردەی قورئانیی) باسی دەکات بەشێوەیەکی جدیتر و قوڵتر. جا ئایا مالك ئاگاداری کتێبەکانی دەراز بووە یاخود تەنها "یەککەوتنی بیرۆکەکانیانە بەشێوەیەکی سەرسامکەر؟"

وادیارە ئەوەی دووەمیانە نەك یەکەم، و بووەتە پێشبڕکێی نێوان دوو بیرمەند. دەراز و مالك بەدەست هەمان دەردی هزرییەوە ناڵاندویانە، و لە هەمان کەشی زانستی دا ژیاون، کە

ڕۆشنبیریی فەرەنسییە، و هەردوکیان ئاگاهییەکی وردیان هەبووە لە نوسینی ڕۆژهەڵاتناسان و گرنگترین ئەو گومانانەی هەبووە لەسەر ڕەسەنایەتی پەیامی قورئان. بۆیە هەردوکیان نوسینە پاراوەکانیان و هزرە درەوشاوەکانیان خستۆتەگەڕ بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەو گومانانە، و گەیشتونەتە دەرئەنجامی نزیك لە یەکتر و هەندێکجار هەمان دەرئەنجام.

دەراز پیا هەڵگوتنێکی نایابی کۆڵینەوەکەی مالکی کرد، و بۆی نوسی:"پێکانی بڕیارت، و گەرمیی بیروباوەڕت، و تازەیی دەستەواژەکانت، و جوانیی شێوازت، هەمو ئەمانە جیاکاریی دیارن کە من ناتوانم مافی خۆتت پێبدەم لە دەستخۆشی لێکردنت لەسەریان". پاشان دەراز نهێنی لێکچوونی زانستیی سەبارەت بە سەرچاوەی قورئان ئاشکرا دەکات، و هەوڵی مالکیش لەو بوارەدا:"ئەم خوێندنەوەی (کتێب)ە هەلی بۆ ڕەخساندم، تا پەی ببەم بەو هەوڵە جدییە سەربەخۆ و لەخۆبوردەییەی پێشڕەوی گەڕیدەکانی دوای ڕاستین بۆ گەیشتنە دەرئەنجامی لێکچوو، بگرە یەك دەرئەنجامیی، سەرەڕای ئەو دوورییە زۆرەی لەنێوانیاندایە لە ڕووی کات و شوێنەوە".

ئایا ئەو مەنهەجە کامەیە کە مالك گرتویەبەر تا بەرهەمی هزری تەواو وەك بەرهەمی هزری دەراز بێت لەم بوارەدا؟ مالك پەی بردوە-وەك دەراز پێشتر پەی بردوە- بە گرنگیی و پێویستیی

پێداچونەوە بەو مەنهەجە باوەی بەکار هێنراوە لە سەلماندنی ڕەسەنایەتی پەیامی قورئان، ئەویش لەبەر"هۆکاری جۆراوجۆر، هەندێکیان پەیوەستن بەو پەرەسەندنە ڕۆشنبیرییەی لە جیهانی ئیسلامی ڕویدا بە گشتی، و هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ ڕەگەزێکیتر، دەکرێت ناوی بنێین پەرەسەندنی تێڕوانینمان بۆ بابەتی ئیعجاز".

هۆکاری یەکەم لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی قوڵی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا لەسەر هزری موسوڵمانان، "بۆیە دەبێت پێداچونەوە بکرێت بە بابەتەکەدا و چوارچێوەی بارودۆخی نوێی ئەمڕۆی موسوڵمانان، لەگەڵ ئەو پێویستییانەی ڕوبەڕویان دەبێتەوە لە ئاستی گیان و بیروباوەڕ". دەبێت مەنهەجی نوێ بونیاد بنرێن تا وەڵامدەرەوەی پرسیارەکانی هزری هاوچەرخ بێت، کە جێی گومانن لە هەموو ئاینەکان، و پەیوەستن بە زانستی ئەزمونگەراییەوە.

هۆکاری دووەمیش لاوازیی چێژ وەرگرتنی خەڵکییە لە زمانی قورئان لە سەردەمی نوێدا بەهۆی ئەوەی زمانی ڕۆژنامە باڵێکێشاوە بەسەر ئاخاوتنی عەرەبیی هاوچەرخدا، جگە لەو موسوڵمانانەی زمانی دایکیان عەرەبی نیە:"ڕاستی وایە موسوڵمانێك نیە، بەتایبەتی لەو وڵاتانەی زمانیان عەرەبی نیە، بتوانێت جیاوازی بکات لەنێوان ئایەتێکی قورئان و بڕگەیەکی

کێشدار یاخود سەروادار لە ئەدەبی جاهیلی، چوون ماوەیەکی زۆرە لە هەستماندا لێزانیی زمانی عەرەبییمان نەماوە، تا بتوانین لە هاوکێشەیەکی ئەدەبیدا ئەنجامێکی دادگەرانەی دانایانە هەڵێنجین. ماوەیەکی زۆریشە بیروباوەڕمان تەنها لەسەر بنەمای لاسایی کردنەوەی پێشینە و ئەویش ساز نیە لەگەڵ هزری کەسانی بابەتیی و بێ لایەن".

بەم جۆرە مالك گەیشتۆتە ئەوەی هۆگریی بە ئیعجازی شێوازییەوە، و وەستان لەو سنورەدا، کەمتەرخەمییە لەلایەن موسوڵمانانی هاوچەرخەوە. لەبەر ئەوەی ئیعجازی قورئان نابێت کاتیی بێت، و پەی پێبردنیشی کورتهەڵبێت لەسەر کۆمەڵێکی سنورداری شارەزا لە شیعرەکانی عەرەب، و چێژ وەرگران لە ڕەوانبێژیەکەیان. بەڵکو کاتێك ئیعجاز قورئانیی دەبێت بەتەواوی کە نەمر بێت وەك نەمریی قورئان، و گشتگیر بێت وەك گشتگیریی پەیامەکەی. بەم شێوازە مالك بۆی دەرکەوت ئیعجازی قورئان-وەك ئەوەی لەمڕۆدا لێی تێبگەین- دەبێت سێ مەرجی تێدا بێت:

یەکەم: "لە ئاستی پەی پێبردنی هەمووان دا بێت...چوون بەهایەکی لۆژیکی نیە بۆ بەڵگەیەك کە لە سەروی پەی پێبردنی نەیارانەوە بێت".

**دووەم: "لەسەرویی توانای هەمووانەوە بێت" لەبەر ئەوەی ئیعجاز بە واتای دەستەوسان کردنی نەیارانە.**

**سێیەم: "کاریگەرییەکەیشی هێندەی کاریگەریی ئاینەکە خۆی پێویست بێت بۆ ئەوانەی گرنگی بە بابەتەکە دەدەن". ئەوەش واتا سنوری کات و شوێن نیە بۆ ئیعجازی پەیامێکی نەمر.**

**بەو جۆرە مالك دەگاتە دەرئەنجامە گەورەکەی کە بونیادی هەموو کۆڵینەوەکەیی لەسەر کردووە. ئەویش ئەوەیە: "پێویستە ئیعجازی قورئان وەسفێکی پەیوەست بێت بە قورئانەوە بە تێپەڕ بوونی کات و نەوەکان، ئەوەش سیفەتێکە عەرەبێکی سەردەمی جاهیلی پەی بە چێژەکەی دەبات وەك عومەر (خودا لێی ڕازی بێت) یاخود وەلید، یاخود پەی پێدەبات بە چێژوەرگرتنێکی زانستییانە، وەك ئەوەی (جاحظ) لە مەنهەجەکەیدا کردی و بووە هێڵکێشان بۆ دوای خۆی. بەڵام موسوڵمانی ئەمڕۆ نە ئەو سروشتە عەرەبییەی سەردەمی جاهیلی هەیە، نە ئەو توانا زانستییەی سەردەمی عەباسییەکان. سەرەڕای ئەمە قورئان بوارە ئیعجازییەکەی لەدەست نەداوە، چونکە شتێکی لاوەکی نیە بەڵکو لە ناوەرۆك و جەوهەری قورئاندایە، بۆیە موسوڵمانی ئەم سەردەمە دەبێت بە شێواز و ئامرازێکی دیکە قسەی لەسەر بکات، وەك ئەوەی کۆڵینەوە لە ئایەتەکە بکات لە بواری پێکهاتەی دەرونیی بابەتییانە، زیاد لەوەی کۆڵینەوە لە دەربڕینەکانی بکات،**

بۆیە مەنهەجێکی شیکاریی نێوەرۆك بەکاردەهێنێت، وەك ئەوەی ئێمە هەوڵماندا‌وە لە کتێبەکەمان دا جێبەجێی بکەین".

بەم چەشنە مالك ئیعجازی ڕەوانبێژی کەنارخست، و شێوازانێکی نوێی هێنایە ئاراوە کە دەکرێت بیخەینە ڕیزبەندی ئەو زانستەی ناومان لێنا (زانستی سەرچاوەی قورئان)بەهۆی فراوانی ئاسۆ و بواری. ئەم جۆرەیان بابەتانێکی وەك (ئیعجازی زانستی و شیکاریی مێژوویی و دەرونی، و بەراوردکاریی لەگەڵ ئاینەکانی دی) و هەر بابەتێکی تریش کە خودایی بوونی سەرچاوەی قورئان دەسەلمێنێت، لەخۆ دەگرێت. دەراز زوتر باسی ئەمەی کردووە لە کتێبی (مدخل الی القران الکریم) و بڕیاری داوە کۆڵینەوە لە قورئان دەبێت"سەربەخۆ بێت لە زمان". بەڵام مالك ئەم مەنهەجەی گەیاندە ئەوپەڕی، و شێوازێکی شیکاریی بەراوردکارییانەی پێدا، وەك دەردەکەوێت لە بەراوردکردنە ناوازەکەی کردویەتی لەنێوان سورەتی یوسف لە قورئان و تەورات دا.

مامۆستا (محمود محمد شاکر) پەی بردووە بە ڕەسەنایەتی مالك لە کتێبەکەیدا بۆیە لەو پێشەکییەی بۆ کتێبەکەیی نوسیوە دەڵێت:"قورسە پێشەکی بۆ کتێبێك بنوسم کە ڕێبازێکی سەربەخۆی هەیە، و وا دەزانم هیچ کتێبێك هاوشێوەی ئەمە نەنوسراوە پێشتر" ئەگەر چی شێخ شاکر-هێندەی من بزانم-

ئەندازەی ئەو شۆڕشە مەنهەجییەی نەزانیوە کە کتێبەکەی مالك لەخۆی گرتووە، و پێش مالکیش کتێبەکانی دەراز، بەو ئەندازەیەی پێویستە. بۆیە لەو پێشەکییەی بۆ کتێبەکەی نوسیوە، بیرۆکە خولگەییە نوێگەرییەکەی پشتگوێ خستووە لە کتێبەکەدا، کە ئەویش پێویستی پێداچونەوەیە بە چەمکی ئیعجازدا، و خوێنەری سەرقاڵ کردووە بە ناکۆکیی دەستەواژەیی دەربارەی واتای "ڕاڤەکردن" و "ئیعجاز"!!

ئەو پێشەکییە ئەو کەسانەی وەبیرهێنامەوە کە بیرۆکە نوێگەرییەکانی دەراز پشتگوێ دەخەن  لەمڕۆدا بەوەی دەیخەنە نێو قاڵبی هزریی کۆنەوە لە کاتێکدا دەراز ویستی تێیان پەڕێنێت.

ناتوانین زیاتر درێژە بدەین بە باسی کتێبەکەی مالك لێرەدا، چونکە ئەم کۆڵینەوەیە تایبەتە بە دەراز، و کتێبی (دیاردەی قورئانی)قوڵتر و فراوانترە لەوەی کورت بکرێتەوە لە پەراوێزی ئەم کۆڵینەوەیە. بە ئومێدی ئەوەی لە کۆڵینەوەیەکی تایبەتدا بگەڕێینەوە بۆ لای مالك و هزری مالك.

بەڵکو تەنها ویستمان هەندێك لە لێکچونەکانی ئەم دوو زانایە ئاشکرا بکەین. پوختەی نزیکیی هزریی نێوانیشیان ئەوەیە: دەراز دەرگای نوێکردنەوەی کردەوە لەسەر بەڵگە هێنانەوە بۆ ڕەسەنایەتی پەیامی قورئان، بە مەنهەجێکی نوێکردنەوە کە ڕەوانبێژیی زمانەوانی تێپەڕێنێت، و مالکیش لەو دەرگایەوە بە

هانگاونانێکی پڕ متمانەوە داخڵ بوو، کە تا ئێستا پێویستمان بە هێڵ بۆ کێشانیەتی.

## کۆتایی

لەم کۆڵینەوەیەدا هەوڵمانداوە بە چڕ و پڕی ناساندنێکی دکتۆر محمد عبدالله دەراز پێشکەش بکەین، لەگەڵ ئەو بیرۆکە گەورانەی پێشکەشی هزری ئیسلامیی هاوچەرخی کرد، بەتایبەتی لە بواری میانڕەوی و نوێکردنەوە. بۆیە ژیانیمان خستە ڕوو لەگەڵ کەسایەتییەکەی، و مەنهەجی بیرکردنەوەی و شێوازی نوسینی. ئاشکرامان کرد؛ قورئانی بەپێز ئەو سەرچاوەیەیە کە هەموو کاریگەرییە زانستی و کردارییەکانی ئەم زانا گەورەیەی سەدەی بیستەمی لێ هەڵێنجراوە.

پاشان باسی بەشدارییە هزرییەکانیمان کرد لە هزری میانڕەوی لەڕێی ئەو پێنج دوانەییەی قسە کردن لەسەریان ئاسان نیە بۆ هیچ سەردەمێك لە سەردەمەکانی ئیسلام، ئەوانیش: ئاوەز و دەق، ئاین و زانست، جەبر و ئیختیار، شوێنکەوتن و داهێنان، ئاشتی و جەنگ. ڕونمان کردەوە؛ مەنهەجی دەراز بۆ قسە کردن

لەسەریان بە قوڵیی و فراوانی دەناسرێتەوە، لەگەڵ توانایی زانستیی، و تێڕوانینی میانڕەوانە.

پاشان ئەو بەش و بوارانەمان باس کرد کە دەراز نوێکردنەوەی تیادا ئەنجام داون، و ڕونمان کردەوە کە بناغەی تیۆریی داناوە بۆ دوو زانستی نوێ لە زانستەکانی قورئان، ئەوانیش (زانستی ڕەوشتناسیی قورئان) و (زانستی سەرچاوەی قورئان)ن، بەجۆرێك کە بناغەی مەنهەجیی دارِشت بۆ زانستی یەکەم بە پێشەنگی، و بە هاوبەشییش لەگەڵ هاوڕێ و هاوگەشتی هزریی و زانستیی خۆی (مالك کوڕی نەبی)ی فەیلەسوفی ژیاری ئیسلامیی، بناغەی زانستییان دانا بۆ زانستی دووەم.

خوازیارین ئەم کۆڵینەوەیە بەشدارییەك بێت لە دەرخستنی بوارەکانی میانڕەوی و نوێکردنەوە لە هزری دەراز دا، بە ئەندازەیەك کە هاندەری خوێنەری بەڕێز بێت بۆ خوێندنەوەی نوسینەکانی. چونکە هیچ قەڵەمێك ناتوانێت وەك قەڵەمەکەی دەراز خۆی، دەربڕی بیرۆکەکانی و هزری و روحی بێت. لەبەر ئەوەی خودا دانایی و زمانپاراوی پێداوە.

ستایش بۆ خودایەك کە بە بەخششەکانی چاکەکان تەواو دەبن.

